دکتۆر شوکری محەمەد سەگبان

# پرسی کورد

## کێشەگەلی کەمینەنەتەوەکان

وەرگێڕانی لە فرەنسییەوە، پێشەکی
و پەڕاوێزنووسینی
د. نەجاتی عەبدوڵڵا




هەولێر - ٢٠١٣



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- پرسی کورد (کێشەگەلی کەمینەنەتەوەکان)
- **نووسینی:** دکتۆر شوکری محەمەد سەگبان
- وەرگێڕانی: د. نەجاتی عەبدوڵڵا
- نەخشەسازی ناوەوە: وەرگێڕ
- بەرگ: ڕێمان
- نرخ: (٢٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم: ٢٠١٣
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەراتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی: (٧٤٠) لە ساڵی ٢٠١٣ی پێ دراوە

**زنجیرەی کتێب (٧٤٣)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# له برێتی پێشەکی

مێژووی بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بە بەراورد بە مێژووی بزووتنەوەی گەلانی جیهان و ناوچەکە، مێژوویەکی هێندە دووروودرێژی نییە. ئەم مێژووە بەشێوەیەکی فیعلی دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی دوای کودێتای تورکە-گەنجەکان (١٩٠٨) و شۆڕشی مەشرووتەی دووەم. لێرە بە دواوە دەکرێ (بە بڕێك پارێزەوە) باسی سەرەتای چەکەرەکردنی جۆرێك لە بیری "کوردایەتی" بکەین کە زۆر بە زەحمەت لەناو چوارچێوەی بیری "عوسمانیەت" دا جیادەکرایەوە. دەستەبژێری کورد لە دەیەی یەکەم و دووەمی سەدەی بیستەمدا هێزێك نەبوو شوێن پێ و پێگەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی خۆی لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا سەقامگیر بێت و لەیەك کاتدا لە ئامادەنەبوونی خەڵك بۆ خەبات یان ڕاستتر لەناهۆشیاری خەڵك لە پەیامی نەتەوایەتی خۆیدا هەم ڕۆڵی سەرکردایەتی و هەم ڕۆڵی ئەوانیشی دەبینی. کورد بەلای کەمییەوە لەوەتای سەدەی شانزەهەمەوە بە ڕەسمی ڕەعیەتگەلی ئیمپراتۆریای عوسمانی بووە و لە ناوچەیەکی دوورەدەستی شاخاوی ئیمپراتۆریای عوسمانی ژیاوە، شاری گەورەی نەبووە، ئابوورییەکەی بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بووە. لەم پارچە زەوییە جوگرافییە داخراو و دوورەدەستەدا هێندەی دیکە پێوەندییە خێڵەکییەکان دەرفەتی ئەوەیان بۆ ڕەخساوە تا هەرچی زیاتر بەناو ناخی کۆمەڵگەدا ڕۆبچنە خوارە و

زۆر بە توندی پێکهاتەی خێڵایەتی بەهێزتر بکەن. لەناو کۆمەڵگەیەکی ئاوها داخراو و پارچە پارچەبوودا، کە خاوەنی هیچ کەڵکەبوونێکی کولتووری نەبێ، کۆمەڵگەیەك کە دەتوانین بڵێین هەر تەنها کۆمەڵگەیەکی (ئۆرگانیکی) بووە، ئەستەم بوو بتوانێ ڕۆحانیەتی نەتەوەیی خۆی بسەپێنێ. ئەو دەستەبژێرەی کە هەیبوون لە شارە گەورەکانی وەکو ئەستەموول، قاهیرە، بەغدا و پایتەختە گەورەکانی ئەورووپادا دەژیان.

ئەگەر لەم نوختە خاڵەوە سەیر بکەین، کە ئەوە نەتەوەیە مێژوو بۆ خۆی دروستدەکات نەك بە پێچەوانەوە، ئەوا دەگەینە ئەو ڕاستییە، کە کورد قەتاوقەت مێژووی بۆ خۆی دروست نەکردووە، چونکە کورد هیچ کات نەیتوانیوە یان نەیویستووە ڕەوتی مێژوو بگۆڕێ و مێژوویەکی دیکە دروست بکات، کە ئەوە یەکێکە لە خەوشە هەرە گەورەکانی کۆمەڵگەی کوردی. خەونی ئینسانی کورد هیچ کات لە ئاسمانی ماڵەکەیی و لە باشترین حاڵیشدا لە ئاسمانی گوندەکەی تێپەری نەکردووە. ئەو نەتەوانەی مێژوو دروست دەکەن ئەو نەتەوانەن، کە خەونی گەورەیان هەیە و شەڕ لەگەڵ ئەستەم دەکەن، بەڵام کورد بە ئێستەشیەوە خەونەکانی هێندە بچووکن کە شایانی ئەوە نین لەناو مێژوودا بنووسرێنەوە.

لە دوای قۆناغی مەشرووتەوە (١٩٠٨) ژمارەیەك ڕووناکبیر و دەستەی ئینتلیگێنسیای کورد سەرەداوی بزووتنەوەی کوردایەتیان گرتە دەست. دەستەی یەکەمی ئەم ڕوناکبیرانە لە قۆناغێکی زۆر ناڵەبار و لەسەر پاشخانێکی زۆر عوسمانییانەوە هاتنە ناو کۆڕی خەبات. کامیران بەدرخان لە چاوپێکەوتنێکدا زۆر جوانی وتووە کە بەشێکی گرینگی کادیرەکانی ئەم قۆناغە: " ئەو کوردانە بوون کە هێشتا بۆنی عوسمانییان لێوە دەهات"[١]. ژمارەیێك لەو تێکۆشەرانەی لەم کاروانەدا ژیانی خۆیان و ماڵ و منداڵی خۆیان لەم ڕێگە سەخت و دژوارەدا کردە قوربانی

1- Hamit Bozarslan, *Le problème nationale kurde en Turquie kémaliste*. Mémoire de DEA de l'E.H.E.S.S, Paris, 1986, P.96

(ناوەکان زۆربەیان پارێزراون و دەکرێ ئەگەر مێژوونووسێك بیەوێ زۆر بەئاسانی لیستێك بۆ ناوەکان بکات). مەبەستم ئەوەیە بڵێم مێژووی بزووتنەوەی کوردایەتی لە دوای قۆناغی مەشرووتەوە تا دەگاتە دامەزراندنی کۆماری تورکیا (١٩٢٣) ئەوەندەی مێژوویێکی دەستەبژێری کوردی بووە، ئەوەندە مێژوویێکی جەماوەری و بزاڤێکی ناو کۆمەڵانی خەڵك نەبووە. ئەم قۆناغە بە هەموو مانایەکەوە قۆناغێکی تازەی لە ژیانی سیاسیی تورکیا هێنایەوە پێشەوە. قۆناغی ئاوابوونی خۆری عوسمانی و لە دایکبوونی کەمالیزم. بزووتنەوەی کەمالیزم لەناو شکستی عوسمانیزمدا جاری بەرگری و بەرهەڵستیکردنی داگیرکارانی وڵاتی ڕاگەیاند. کورد لەناوەوەی کوردستان و بە تایبەتی سەرۆکهۆزە کوردەکان پشتگیرییێکی بێوێنەیان لە بزووتنەوەی مستەفا کەمال کرد، بە پێچەوانەوە دەستەی ئینتلیگێنسیای کورد لە ئەستەموولْ زۆر هۆشیارنە دەیڕوانیە ئەو بزووتنەوەیەی لە ئەنادۆڵ و کوردستان خەریکی خۆڕێکخستنەوە و بەرەنگاری بوو. بەڵام ڕاستییێك هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە دەستەی ئینتلیگێنسیای کورد لە ئەستەموولْ هیچ پێوەندییێکی ئاوای بە ناوەوەی کوردستانەوە نەبوو. ئەوەی لە کوردستاندا دەسترۆیشتبوو بوو، ئەوە بزووتنەوەی کەمالیزم بوو. بۆیە لەم قۆناغەدا زۆر بە ئاسانی هەست بە مێژووی خەباتی ڕووناکیرانی ئەو سەردەمەی کورد دەکرێ، ناوەکانیش وەکو کۆمەڵێك ئەستێرەی درەوشاوە لە ئاسمانێکی ئەنگوستەچاودا زۆر بە جوانی دەدرەوشێنەوە. بەڵام زۆر بە زەحمەت دەتوانرێ پێگە و جومگە سەرەکییەکانی خەباتی جەماوەریی دیاری بکرێت. بۆیە ئەم بزووتنەوە کوردایەتییە زیاتر لەناو ڕووناکبیرانی کورددا بوو و بە هیچ شێوەیەك نەبووبووە دروشمگەلی ناو کۆمەڵانی خەڵك و بیرۆکەی سەربەخۆیی لەناو جەماوەردا تا ڕادەیەکی تەواو دەکرێ بڵێین هەر "ون" بوو. لەم ڕوانگەیەوە تا دوای تێکشکانی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ یش، هۆشیاریی "کوردبوون" لەناو خەڵکدا هێندە کز بوو کە دەشێ بە نەبووی دابنێین. ڕەوتی سیاسی زیاتر لەژێر بەها ئایینیەکاندا بوو و ئەوەندەی کورد لە دەوری دروشمەکانی مستەفا کەمال کۆبووبوونەوە، کەمتر لە چارەگێکی ئەوە لە دەوری

ڕێکخراو و یانە کوردییەکان کۆنەبوونەوە[٢]. بۆیە دەشێ بە بێ سڵەمینەوە ئەم قوناغە زیاتر بە قۆناغی خەباتی دەستەی ئینتلیگێنسیای کورد دابنێین. یەکێك لەو ڕووناکبیر و تێکۆشەرانەی دەستەی یەکەمی ئەو ئەستێرانەی وا بە ئاسمانی تاریك و نووتەکی کوردایەتی ئەو سەردەمانەدا دەدرەوشێنەوە، نووسەری ئەم کتێبەیە، "دکتۆر محەمەد شوکری سەگبان"ە، کە زیاتر لە یەك چارەگە سەدەی ژیانی سیاسیی خۆی بۆ نەتەوەکەی تەرخان کرد. سەگبان لە ساڵی ١٩٠٨ەوە تاوەکو ساڵی ١٩٣٢ بێلێبڕان یەکێك لە پێشڕەوانی بزووتنەوەی کوردایەتی بووە. ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری جەمعییەتی تەعاون و تەرەققیی کورد (١٩٠٨) و ئالیکار و پشتگیریکارێکی گەورەی جڤاتا هێڤی قوتابیانی کوردان[٣] (١٩١٢) و ئەندامی جەمعیەتی تەعالیی کورستان (١٩١٨-١٩٢٠) و ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری جەمعیەتی ئیجتیماعیی کورد (١٩٢٠) و ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری خۆیبوون (١٩٢٧) و نوێنەری کۆمەڵەی خۆیبوون بوو لە بەغدا (١٩٢٧-١٩٢٩). تا دوای تێکشانی بزووتنەوەی چەکداریی ئارارات ١٩٢٧-١٩٣١ یەکێك لە خەباتگێڕە گەورەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی بووە.

---

[٢] قەتڵوعامی کورد لە تورکیا، لەفرانسییەوە وەرگێڕانی، پێشەکی و پەراوێزنووسیی د. نەجاتی عەبدوڵڵا، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٨، لا: 12

[٣] زنار سلۆپی لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ: " ئێمە پێوەندییێکی توندوتۆڵمان لەگەڵ دکتۆر شوکری محەمەد بەگ هەبوو، کە فەزلی ئەوەی لەسەرمان هەبوو چەمکە ئیلهامبەخش و تێنوویەکانی هۆشیاری و هەستی نەتەوەیی ئێمەی جۆش دەدا. هەر لە سایەی ئەوەوە بوو کە توانیمان ژوورێك بۆ بارەگای کۆمەڵەی هێڤی لە سیرکەچیی بەرانبەر بە مزگەوتی نوێ لە باڵاخانەی "ئەرزەرۆم" بەکرێ بگرین و ئەمەمان لە ڕۆژنامەدا ڕاگەیاند". بڕوانە: زنار سلوپی، *في سبیل کردستان (مذکرات)*، ترجمة ر.علي، منشورات دار رابطة کاوا ـ بیروت، ١٩٨٧، ص: ٢٦

تێکشکان و داپلۆسینی بزووتنەوەی ئارارات لە کوردستانی تورکیا، پێشتریش تیرۆرکردن و کوشتنی سمکۆی شکاك لە کوردستانی ئێران و شکستی بزووتنەوەی شێخ مەحموودی حەفید بەدەست سوپای کۆلۆنیالی ئینگلیز و دەوڵەتی عێراق، کەش و هەوایەکی وای هێنایە بەرچاو، کە ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستەم ئیدی کوردستان تروسکەی ئومێدی هەستانەوەی تێدا بەدی نەکرێت. سەقامگیربوونی دەوڵەتی تورکیا و عێراق و سەرباری هەموو ئەمانەش نەخۆشی دەردە باریکە، تینی لە دکتۆر محەمەد شوکری سەگبان بڕیبوو، وا ئەم تێکۆشەرەی کاروانی دووروودرێژی کوردایەتیان گەیاندبێتە ئەو دەرئەنجامەی کە دوای زیاتر لە چارەگە سەدەیەك لە خەباتی کوردایەتی، ئیدی دەست لەم خەباتە بەربدات و بچێتەوە لە تورکیا دابنیشێ و دەستبەرداری کوردایەتی ببێ. بۆ ئەم مەبەستە سەگبان لە بریتی ئەوەی لە دەرگاوە بگەڕێتەوە بۆ تورکیا کەچی لە "پەنجەرەوە" گەڕایەوە. لێرە سەگبان پشت لە مێژووی چارەگە سەدەیەکی کوردایەتی خۆی دەکات و بە نووسینی ئەم کتێبە گۆڕی هەموو هاورێ شەهیدەکانی خۆی هەڵدەتەکێنێت و هەموو ڕاستی و فاکتە مێژووییەکان ئاوەژوو دەکاتەوە و ئاگر بە چارەگە سەدەیەکی زیاتری مێژووی خۆیەوە دەنێت.

دوای تێکشکانی ڕاپەرینی ئاگری داغ (١٩٣١)، تورکیای کەمالیست بڕیاری ئەوەی دا ئەمجارە تورکیا بکات بە دەوڵەتێکی تورکی و هەموو شوێنەوارێکی کوردی بسڕێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە لەدوو ڕووەوە کەوتە کارکردن: لە لایەنی فیزیکییەوە یاسای کۆچپێکردنی هۆزەکانی دەرکرد بۆ کۆچ پێکردنیان لە خاکی باوباپیران و هاوکات هەنگاوی دووەمی بە تورکیکردنی مێژوو و زمانی کوردی بوو. لە ساڵی ١٩٣٠-ەوە زنجیرەیەك کتێب بە زمانی تورکی دەرچوون کە لەسەر بنچینەی تورکبوونی کورد و هەتا تورکبوونی هەموو زمانانی جیهانیشدا پێ دادەگرن. گومانەکەی مارتین شترۆمییێر زۆر لە جێی خۆیەتی کە پێی وایە سەگبان ئەو کتێبانەی ئەنیستیتووی تورك بۆ مێژوو و زمان کە دوای ساڵی ١٩٣٠ بڵاویکردوونەتەوە،

خوێندبێتەوە[٤]. من لێرەوە گومانی زۆرم بۆئەوەش دەچێ، کە ئەم کتێبە (پرسی کورد) بەشێوەیەك لە شێوەکان لەلایەن ئەنیستیتووی مێژووی تورك و سەگبانەوە ئامادەکرابێت و بنەما بنچینەییەکانی کتێبەکە لە لایەن ئەنیستووتی تورك بۆ مێژوو دارێژرابێت و شێوەی نووسینی کتێبەکەش بۆ سەگبان هێڵدرابێتەوە. پرسیار ئەوەیە لەم کتێبەدا کە لێرەدا کراوە بە کوردی و ساڵی **١٩٣٣** لە پاریس بە فرەنسەوەی بڵاوکراوەتەوە، چۆن سەگبان توانیویە لە نەخۆشخانە ساڵی **١٩٣٢** بۆ نووسینی ئەم کتێبە سوود لە کتێبێکی تیۆرسینی ناسیۆنالیزمی ئەڵمان ماکس هێلدەبێرت بۆیم وەربگرێ کە چاپی یەکەمی ئەڵمانی کتێبەکە لە دوای مانگی نیسانی ساڵی **١٩٣٢** لە گوتینگن بڵاوکراوەتەوە[٥]. ئەمە با واز لەو پرسیارانەش بهێنین، داخۆ سەگبان زمانی ئەڵمانی زانیووە یان نە؟ ئایا ئەڵمانی زانییەکەی ئەوەندە سەروو بووە، هەرزوو بەزوو سوود لە کتێبێکی تازە دەرچووی ئەڵمانی وەربگرێ بۆ نووسینی کتێبێك بە زمانی فرەنسەوی؟ ڕەنگە فرەنسەوی زانینەکەی کەمتر جێگەی گومان بێت، چونکە لەو نوسخەیەی کتێبە فرەنسییەکەی، کە پێشکەش بە جەنەراڵ شەریف پاشای کردووە بە دەستخەتی خۆی بە فرەنسییەکی زۆر بەرز نووسیوویە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا من گومان دەکەم کە نووسینی ئەم کتێبە بە چەشنێك لە چەشنەکان هاریکارییەك

---

[4] Martin Strohmeier, *Crucial images in the presentation of a Kurdish national identity : heroes and patriots, traitors and foes*, Social, economic and political studies of the Middle East; 86, Leiden : Brill, 2003, p.١١٩

[5] BOEHM, Max Hildebert, *Das eigenständige Volk. Volkstheoretische Grundlagen der Ethnopolitik und Geisteswissenschaften*, Göttingen: Vandenhoeck & Ruprecht, 1932. (389p)

بووبێت لەنێوان سەگبان و ئەنستیتووی مێژووی تورك و دەزگای چاپەمەنی زانکۆیی فرەنسیی لە پاریس.

لەم کتێبەدا کە بە زمانی فرەنسی نووسیوویە، سەگبان جەخت لەسەر ئەم فاکت و دەرئەنجامانە دەکاتەوە، کە ئەنستیتووتی تورك بۆ مێژوو کاری بۆ دەکردن. سەگبان پێی لەسەر ئەم دەرئەنجامانە دادەگرێ:

A Son Excellence
le Général Chérif Pacha
En souvenir ému
d'une amitié affectueuse
sans bornes avec
l'hommage de mon
profond respect
Bagdad, le 21 février 14
Prof. D. S. Sekban

**دەستخەتی نووسەر لە پێشکەشکردنی کتێبەکەی بە فرانسی بۆ شەریف پاشا**

١-کورد لە نەوەی گوتییەکانن نەك نەوەی مادەکان. کوردەکان وەکو هاوبەش یا وەکو بەکرێگرتە لە ڕیزی سوپای فارس ئالیکاریان کردووە، بڕێك سەربەخۆیی خۆیان پاراستووە و بەشداریشیان لە گەورەکردنی ئیمپراتۆریای فارسدا کردووە.

٢- میدییەکان لە باشوور-ڕۆژهەڵاتی زەریای خەزەرەوە هاتوون (سەدەی نۆیەم —سەدەی دەیەمی پێش زایین) و کوردستانیان داگیرکردووە و ئیمپراتۆریایەکیان دروستکردووە کە ناوەندەکەی کوردستان بووە. ئەوان تەنها چەند غەوارەیەك بوون کە لە سۆنگەی ڕێکخراوە نایابەکانیان، کوردەکانیان - نزیکەی دوو هەزار ساڵ بەر لە هاتنی میدییەکان لەناوچەکە بوون.

٣-کوردەکان نە ئارین و نە سامی، بەڵکو بەگوێرەی زانا ئەڵمانەکان لە ڕەگەزی تۆرانین و ئامۆزای تورکەکان. لە ڕێگەی شیمانەی بنچینەی تورانیی بوونی کوردەکان، بوونی تورکەکان لە ئەنادۆلی ناوەڕاستی ئەمڕۆ دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە هەرە دوورەکانی مێژوو و کورد و تورك بە دوو گەلی ئامۆزا دادەنرێن.

٤- میدییەکان وەك چۆن لە بنچینەی گەلانی ئاری بوون، لەکاتی حاکمیەتی خۆیان لە کوردستاندا، زمانی خۆیان هێناوە و لەگەڵ زمانی ڕەسەنی گەلی کورد تێکەڵیان کردووە. ئەوە لێرەوەیە کە خزمایەتی زمانی کوردی لەگەڵ زمانی فارسی سەرچاوەی گرتووە. دواجار نووسەر زمانی کوردی بە درەختێکی قەدبڕاوی سەرما بردوو دەچوێنێ، کە هیچ نرخێکی نییە، هەر شایەنی ئەوەیە لە ڕەگەوە هەڵبکێشرێ و دەربکێشرێ.

٥-کورد بەڕێوەبردنیان لە لایەن بێگانەوە هەمیشە شتێکی نایاب بووە. ئەمەیان زەینییەتی کوردە و لەوەتای چل و هەشت سەدە دەبێ هەروابووە. لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە هیچ سیاسەتوانێکی کورد بە ڕاستی قەناعەتی ئەوەی نەبووە، کە پێویستە کوردستان لە تورکیا جیابکرێتەوە. هەتا لە تەنگەتاوترین کاتی تورکیاشدا، کوردەکان لە ڕاستیدا مەیلی جوداخوازیان نەبووە.

٦- دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دەبێتە کارەساتێك، بەڵایەك بۆ سەر قازانجی ڕاستەقینەی بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد.

٧- کورد نابێت لە تواندنەوە لە لایەن تورکەکان بترسێ، چونکە گەلێکی بەهێز دەزانێ چۆن گەلێکی لاواز بتوێنێتەوە بە بەکارهێنانی وەسیلەگەلی نەرم و نیان، هاوسۆزی لەگەڵیاندا و لە خۆیان جیاناکاتەوە. دواتر ئەوەی لە تورکیا دەگوزەرێ، ئەوە ئامانج تێیدا تواندنەوەی کوردەکان نییە، بەڵکو تەنها یەکخستنی دوو گەلی هاوڕەگەزە.

٨- بە زمانی کوردی بە ئاستەم هەر دە دوانزە نامیلکە و کتێبێك چاپکراون بۆیە لێرەوە تا سەدەیەك زمانی کوردی ئەگەر لە باشترین ڕەوشی جیهانیشدا پەروەردە بکرێ، هێشتا بەوە ڕاناگات بگاتە ئاستی دەوڵەتگەلی کولتووری و تێراپی خوێنەری کورد بکات.

٩-تورکیا تاقە کۆمارە کە کێشەی کەمینەنەتەوەکانی چارەسەر کردبێت. بەو پێیەی کورد لە هەمان ڕەگەزی تورکەکانن، بۆیە بە یەکبوونیان لەگەڵ تورك، نەتەوەی نوێی تورك دروست دەکەن.

١٠- ئەوە جێگەی شادومانییە و سەرمایەیە بۆ نەتەوەیەك، کە سەرکردەیەکی وەك "غازی" موستەفا کەمال لە لووتکەی حوکمڕانی وڵاتدا بێت و بانگەوازی کوردەکانی تورکیا

دەکات، بە شوێن ئەو ڕێچکەیەوە بچن کە سەرکردەی بەناوبانگ، موستەفا کەمال پاشا، بەشێوەیەکی هەرە شایان بۆی دیاری کردوون. هەرچی کوردەکانی دەرەوەی تورکیایە، تەنها ئەوەیان بۆ هەیە بە ژێری لەگەڵ هەموو ئەو ڕەگەزانە بژین کە ئەو دەوڵەتانە پێك دەهێنن کە تییاندا دەژین، هیچ چەشنە گیروگرفتێك بۆ حکومەتە تایبەتییەکانیان دروست نەکەن.

شایانی گوتنە پێش دکتۆر محەمەد شوکری سەگبان، کەسانی دیکەی ڕوناکبیر و سیاسەتوانی کوردستانی تورکیا وەك: مەسعوود فانی و خەلیل بەدرخان و مەولانا ڕەفعەت زادە و فانی زادە عەلی عیلمی و گەلێکی دیکە لەو کوردانەی کاروانی دوورودرێژی کوردایەتی ماندووی کردبوون، سوودیان لە لێخۆشبوونە (١٥٠) کەسییەکەی مستەفا کەمال وەرگرت و گەڕاونەتەوە بۆ تورکیا، بەڵام ئەوان نەچوون ئایدۆلۆژیای کەمالیزم و تێزی دەوڵەتی تورکیا بەسەر کورددا بکەنە ڕاستییەکی مێژوویی و ئاگر بەربدەنە ڕابووردووی خۆیان. بۆیە ئەوەی سەگبان کردی ئەگەر لە ساویلکەییەوە بێت یان بە دەستی ئەنقەست کردبێتی، هەر بەڕاستی کوشتنی مێژووی خۆی بوو، کە چارەگەسەدەیەك زیاتر ماندووبوون و ڕەنجی بۆدابوو. تۆژەری ئێرانی، نادر ئینتسار زۆر جوانی بۆچووە کە دەنووسێ: "*سەگبان مێژوویێکی درۆزنانەی کوردیی لەگەڵ کۆمەڵێك درۆی زمانەوانی پەرەپێداوە، کە بەشێوەیەکی بڕاوە کورد دەخاتە باوەشی خێزانی گەلانی تورکزمان*"[٦]. شایانی گوتنە ئەم کتێبەی سەگبان وەرگێردراوەتە سەر زمانی تورکی و تا ئێستە چەندین جار چاپکراوەتەوە و دەوڵەتی تورکیا هەمیشە بە قازانجی خۆی بەکاریهێناوە. مەسەلەی پەشیمانبوونەوەی د. سەگبان و بەسەرهەڵدانی مستەفا کەمال لەلایەن ناوبراوەوە، ٦٦ ساڵ دوای ئەو ڕووداوە لە ساڵی ١٩٩٩دا، لەکاتی دادگاییکردنی عەبدوڵڵا ئۆجالان سەرۆکی گشتی ڕێکخراوی پارتی کرێکارانی کوردستانیشدا، دووبارە باس کراوەتەوە. لە دادگاکەدا

[6] Nader Entessar, *Kurdish Politics in the Middle East*. Rev. ed. - Lanham, MD : Lexington Books, 2010, p.125

پارێزەر فوئاد تورگوت و عەبدوڵلا ئۆجالان سەبارەت بەو مەسەلەیە بەمجۆرە لەگەڵ یەکدا قسە دەکەن:

**پارێزەر فوئاد تورگوت:**

-بۆچوونەکانی د. محەمەد شوکری سەگبانت پێچۆنە؟ وەکو ئەو بیر دەکەیتەوە.

**ئۆجالان:**

-لە ساڵی ١٩٢٠دا جەمعییەتی تەعالیی کورد هەبووە. ئەم ڕێکخراوە پەیوەندی لەگەڵ هێزی دەوڵەتانی هاوپەیماناندا هەبووە. هەموو دامودەزگا کوردییەکان توشی جیابوونەوە و دووکەرتبوون بوون. لایەنگرانی سەگبان خەتی فیکری تورکیایەکی دیموکراتیك قبوڵ دەکەن.

**پارێزەر فوئاد تورگوت:**

-دەتوانین تۆ وەکو نەتەوەپەرستێکی تورك دابنێین ؟

**ئۆجالان:**

-وەها نە، بەڵام بڕوام بە نەتەوەگەرایی ئەتاتورکی، نەتەوەگەرایی کولتووریی هەیە[٧].

ڕەنگە ئەو قسەیەی نووسەری بەڵگەنامەیی و دیپلۆماتکاری تورك، بیلال شمشیر بەس بێت بۆ ئەم پێشەکییە کەوا سەگبان بەو ئەنجامە گەیشتبوو کە "*نەتەوەی کوردی تۆرانین و لە نووسینەکانی پێشووی خۆی پاشگەزبۆتەوە و وا پێدەچێت کتێبی (پرسی کورد)ەکەی بە فرمێسکەوە نووسیبێت*"[٨].

وەرگێران و بەکوردیکردنی ئەم کتێبە لە فرەنسییەوە بۆ ئەوەیە ئەوە بە گوێی نەوەی نوێدا بچرپێنین کە سووتاندنی مێژوویەك واتە سووتاندنی کەسەکە خۆیی، بۆیە

---

[٧] مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان* ١٩١٢-١٩٢٢ *(یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)*، لەتورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەلاتی، پێشەکی و پێداچوونەوەی عەبدوڵلا زەنگەنە، لە بلاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل:١٣١-١٣٢

[8] Bilal N. Şimşir, *Kürtçülük 1924-1999*, Ed. Verlag Bilgi Yayınevi, 2009, Ankara, p. 143

ئێستە سەگبان وەك "تێكۆشەرێكی كوردایەتی" و "هەڵگەڕاوەیەك لە بنچینەكەی خۆی" تەماشا دەكرێت و لەنێوان ئەم دوو تێزەدا ئەوەندەی بە "هەڵگەڕانەوەكەی" ناسراوە ئەوەندە بە "تێكۆشانەكەی" نەناسراوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا درود بۆ مێژووی چارەگە سەدەیەك زیاتری كوردایەتی ئەم پیاوە و نەفرەت لەو "پاشگەزبوونەوە" مێژووییەی، كە لەم كتێبەدا نووسراوەتەوە و بە قسەی خۆشی هەر تەنها "درۆینە و پروپووچ" بوون.

د..نەجاتی عەبدوڵڵا

هەولێر-سلێمانی

ئۆكتۆبەر-نۆڤەمبەری ٢٠١٢

# پۆرترێتێکی شکاو:

# سەرچڵێك لەبارەی ژیان و بەرهەمەکانی

# دکتۆر محەمەد شوکری سەگبان

# (١٨٨١-١٩٦٠)

محەمەد شوکری سەگبان کوڕی محەمەد ئاغـای ئەفسـەری سـوپای عوسمـانی بووە و بە گوێرەی زۆربەی سەرچاوەکان لـە سـاڵی١٨٨١[٩] لـە پاقرمـادەنی سـەر بـە دیاربەکر لە دایك بووە. قوتابخانەی سەرەتایی لە ئەرغـەنی و هـۆزات (قـزڵ کلیسـە)

---

[٩] لەناو هەموو ئەو سەرچاوانەی ئێمە پشکنیوومانە تـەنها پرۆفیسـۆر حەمیـد بۆزئەرسـلان سـاڵی ١٨٧٠ ی بۆ لە دایکبوونی سەگبان داناوە. بروانە Hamit Bozarslan, *Le problème nationale kurde en Turquie kémaliste* لا: ١٢٢. ڕاستیەکەی گەرچی کاتـالۆگی کتێبخانەی نیشتمانیی پاریس، کتێبخانەی کۆنگریسی ئەمریکی و کتێبخانەی نیشتمانیی تورکیاش هەر ساڵی ١٨٨١ یان بۆ لە دایکبوونی دانـاوە، بـەڵام مـن لام وایـە سـاڵی ١٨٧٠ زۆر زیـاتر لـە ڕاستییەوە نزیکترە. شوکری لە کتێبی "پرسـی کورد"ەکـەی خۆیـدا کـە سـاڵی ١٩٣٣ لـە پـاریس چاپکراوە دەڵێ بەر لە ٣٧ ساڵ کەوتۆتە ناو کاری سیاسییەوە، ئەمە واتە شوکری لە سـاڵی ١٨٩٦ چووەتە ناو دونیای سیاسەتەوە کە ئەوکات تەمەنی هەر چواردە ساڵان بووە کە ئەمە گومان دەخاتە سەر ئەوەی مێردمنداڵێك لە تەمەنی (١٤) ساڵی بچێتە ناو دونیای سیاسەتەوە، هەرچۆنێك بێت با ئەم گومانە بۆ سەرەداوەکانی دوارۆژ جێبهێڵین، وەرگێر.

تەواو کردووە. پاشان قۆناغی ناوەندی لە دیاربەکر و دواناوەندیشی لە ئەستەمبووڵ و تەواوکردووە. ساڵی ١٩٠٣ خوێندنی پزیشکی لە ئەکادیمیای پزیشکەوانیی نەخۆشخانەی سەربازیی گوڵخانە (گاتا) لە ئەستەمووڵ تەواو کردووە و پلەی کاپیتانی پسپۆری لە نەخۆشیەکانی پێست وەرگرتووە. کۆلیژی پزیشکی لە پاریس و بەرلین و ڤیەننا تەواو دەکات. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٠٥ تا ١٩٠٧ لە نەخۆشخانەی سەربازی ئەدرین کاری کردووە. ساڵی ١٩٠٨ چۆتە ئەستەمووڵ و لە کۆلیژی پزیشکی ئەستەمووڵ مامۆستا بووە و هاوکات سەرۆکی کۆمەڵەی نەخۆشییەکانی پێست و فەرەنگی بووە. لە ٢ ی ئۆکتۆبەری ١٩٠٨ دەبێتە ئەندامی جەمعیەتی تەعاون و تەرەقیی کورد و ساڵی دواتر ئەم کۆمەڵەیە دادەخرێ. لە بارەی قۆناغی ژیانی سیاسیی د.محەمەد شوکری سەگبان بەر لە مەشرووتە ١٩٠٨ هیچ سەرەداوێکی وامان لەبەردەست دا نییە. بە گوێرەی کتێبی (پرسی کورد) ەکەی خۆی بێت دەبێ لە ساڵی ١٨٩٦(؟) تێکەوڵاوی ژیانی سیاسیی بووبێت یان هەر هیچ نەبێت لەو ساڵەوە هەستی بەشداریکردنی ژیانیی سیاسیی تێدا ڕوابێت. بەداخەوە ئێمە هیچ سەرەداوێکی وامان لەبەردەست دا نییە تا بزانیین داخۆ لەم ساڵانەدا کە هێشتا هیچ ڕێکخراوێکی کوردی بوونی نەبووە، داخۆ لەو ساڵانەدا تاوەکو مەشرووتەی ١٩٠٨ کە دەکاتە نزیکەی (١٢) ساڵ (؟) لە کام کایەی سیاسیی کاری کردووە.

شوکری بەگوێرەی نووسینی خۆی بێت دەبێت یەکێك بووبێ لە سیاسییە وتاربێژەچاکەکان، بۆیە دەبینین لە کاتی دامەزراندنی جەمعیەتی کورد تەعاون و تەرەقیی کە لە ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٨ دامەزراوە، لە هەڵبژاردنی بیرۆی بەڕێوەبەرایەتی جەمعیەتدا دوای نەعیم بەگی بابان زۆرترین دەنگی بەدەستهێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا نە لە بنەماڵەیەکی ناسراو و دەستڕۆیشتوو بووە و تەنها وەك خۆی گووتەنی" سۆزی گەرمایی ڕۆحم دڵی ئەوانەی گەرم دەکردەوە کە هەر نەشیاندەناسیم". بە گوێرەی ، ئونگۆر تۆژەر و مامۆستای زانکۆی ئوترێخت، ڕۆژی ١٩ ی ئەیلوولی ١٩٠٨، موفتی سوبحی، لقی ئۆفیسی دیاربەکری جەمعیەتی تەعاون

و تەرەققیی کوردی لە دیاربەکر کردەوە[١٠]. لە گرینگترین ئەندامەکانی ئەو لقە دکتۆر محەمەد شوکری سەگبان، پارێزگاری پێشووی دیاربەکر پیرنجی زادە عارف، میرکاتب زادە ئەحمەد جەمیل (ئاشنا)، محەمەد تاهیر و خەلیل خەیالی بوون. بەگوێرەی پەیڕەوی ناوخۆی ڕیکخراوەکە هەوڵی چاوەدێریکردنی دەستوور و بەدواداچوونی چەمکی عوسمانیزم و کۆتایی هاتنی جەنگی خێلەکیی و بەرقەرابوونی ئاشتەوایی لەنێوان هاونیشتمانییە ئەرمەنەکان، نەستوورییەکان و ڕەعیەتگەلەکانی دیکەی عوسمانی دەدات[١١].


کۆمەڵەی پزیشکی پێست و فەرەنگی ئەستەمووڵ ١٩١٩ ١٩١٩

[١٠] پێم وابێ ئۆنگۆر لەوەدا بەهەڵەداچووە کە مێژووی کردنەوەی لقی دیاربەکری بە مێژووی ١٩ ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٠٨ داناوە، سەرچاوەی هەڵەکەش لەوەدا هاتووە کە ئەم مێژووە بریتیە لە مێژووی دامەزراندنی جەمعیەتی تەعاون و تەرەقیی کوردی وەك لەسەر بەرگی پێڕەوی ناوخۆی جەمعیەتەکەدا هاتووە، ئەوەی کە لەسەر بەرگی پەیرەوی ناوخۆکە مێژووی (١٩ی ئەیلوولی ١٣٢٤) نووسراوە، بێ گومان ئەمە ساڵی ڕۆمییە، بۆیە بە گۆڕینی ئەم مێژووە بۆ مێژووی زایینیی دروست بەرامبەر ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٨ دەوەستێت، هەر وەك ئەوەی لەسەر بەرگی پێڕەوی ناوخۆی جەمعیەتەکەدا هاتووە. هەڵەیەکی دیکە ئەوەیە من گومان دەکەم کردنەوەی لقی دیاربەکر و بارەگای گشتی لە ئەستەمووڵ لە یەك کاتدا بووبێ، وەرگێڕ.

[11] Ugur Ümit Üngör, *The Making of Modern Turkey: Nation and State in Eastern Anatolia, 1913-1950*, Ed. Oxford University press, 2011, p.47

شوکری لە دامەزراندنی کۆمەڵەی هیڤیا قوتابیانی کورد لە ئەستەموولْ کە لە دوادواییەکەی تەمموزی ١٩١٢ دامەزرا وەکو پزیشکێکی نیشتمانپەروەر لە ئەستەموولْ یارمەتی و کۆمەگی ماددی ومەعنەوی ئەم کۆمەڵەیە دەکات تەنانەت لەسەر ئەرکی خۆی ژوورێکی بۆ بارەگای کۆمەڵەی هێڤی بەکریْ گرتووە. لە برێك لەسەرچاوەکاندا د. شەکری سەگبان بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی هیڤی قوتابیانی کورد داندراوە، وەك لای ڕۆهات ئالاکۆم[١٢] و ژۆردی تێژیل[١٣]دا. بەلاّم من لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیم چونکە دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە هەر تەنها ئەم چوار کەسە بوون:

١- قەدری جەمیل پاشا (زنارسلۆپی).
٢- عومەر جەمیل پاشا.
٣- فوئاد تەمۆی کوڕی تەوفیق بەگی نوێنەری وان.
٤- دیاربەکرلی جەڕاحزادە زەکی[١٤].

---

[١٢] ڕۆهات ئالاکۆم، *خۆیبوون و شۆڕشی ئاگری*، شوکور مستەفا کردوویە بە کوردی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠، لا: ٣٠

[١٣] بڕوانە:

Jordi Tejel Gorgas, *Le mouvement kurde de Turquie en exil: continuités et discontinuités du nationalisme kurde sous le mandat français en Syrie et au Liban, 1925-1946.* P. Lang, 2007, p. 130

[١٤] مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢ (یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)*، لەتورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەلاّتی، پێشەکی‌و پێداچوونەوەی عەبدوڵلاّ زەنگەنە، بلاّوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، لا:٩٧

هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی یەکەمی جیهانی هەموو چالاکییەکی سیاسیی کوردی دەوەستێنێ و بە هەموو پێوانەیەك بێت دەبێ سەگبان لەم ساڵانە هەر لە ئەستەمووڵ یان لە تورکیا نەچووبێتە دەرەوە.



عارف پیرنجی زادە - ١٩٢٠

قۆناغی دووەمی ژیانی سیاسیی سەگبان لە دوای ئاگربەسی مودرۆس دەست پێدەکات وەختایەك لە ١٧ ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ لە ئەستەمووڵ (جەمعیەتی تەعالیی کوردستان) دادەمەزرێ، سەگبان یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەڵەیە و لەوە بەدواوە ئیدی واز لە پیشەی پزیشکی دەهێنێ و خۆی بۆ خەباتی سیاسیی کوردایەتی تەرخان دەکات.سەگبان ساڵی ١٩١٩ سەفەرێکی بەغدا دەکات و دوایی دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەمووڵ و لە ریزەکانی جەمعیەتی تەعالیی کوردستان کاردەکات. شایانی گوتنە ئەم ڕێکخراوە هەر لە دوای دامەزراندنییەوە لەناوخۆیدا دووباڵی ناکۆکی تێدا ڕوابوو: باڵی سەربەخۆخواز (بنەماڵەی بەدرخانییەکان و بەشێکی زۆری ڕووناکبیرەکان) و باڵی کۆنسێرڤاتۆر (بنەماڵەی شەمدینانی). نیسانی ١٩٢٠ جەمعیەتی تەعالیی کوردستان کەمتر لە دوو ساڵ دوای دامەزراندنی دووکەرت بوو و باڵی بنەماڵەی بەدرخانییەکان و بەشێکی بەرچاوی ڕوناکبیرانی کورد لە جەمعیەتی تەعالیی کوردستان جیابوونەوە و کۆمەڵەیەکی نوێیان بەناوی (جەمعیەتی ئیجتیماعیی کورد) دروستکرد و باڵی سەیید عەبدوالقادر شەمزینانی بەناوی (کۆمەڵەی کورد و کوردستان) درێژەیان بە کاری سیاسیی خۆیان دا. دکتۆر محەمەد شوکری سەگبان لەم دووکەرت بوونەدا وەکو زۆربەی ڕوناکبیرەکانی ئەوسا، وەك: مەمدوح سەلیم، د. عەبدوڵڵا جەودەت، نەجمەددین حوسێن و زۆری دیکە بەگەڵ کۆمەڵەی ئیجتیماعیی کورد کەوتن. لەگەڵ کۆتایی ساڵی ١٩٢٢، دوای ئەوەی هێزەکانی موستەفا کەمال ئەستەمووڵ دەگرنەوە

هەموو کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردی و کەسایەتییە نیشتمانپەروەرەکان لە ئەستەمووڵ هەڵدێن، شوکری یەکێك لەوانە بوو کە وڵاتیان جێهێشتووە و شیمانەی زۆر ئەوەیە لە دوادواییەکەی ساڵی ١٩٢٢ یان سەرەتای ساڵی ١٩٢٣ گەیشتبێتە بەیرووت و لەوێ نامیلکەی (کوردەکان چیان لە تورکەکان دەوێ؟) بە تورکی عوسمانلی دەنووسێ و ساڵی ١٩٢٣ لە قاهیرە لە لایەن (م، ع) بڵاودەبێتەوە[١٥]. لەم نامیلکەیەدا کە بریتییە لە چەند نامەیەك کە بە مێژووی ١٩٢٣/١٢/١٨، بۆ نوێنەری شاری دیاربەکر فەیزی پیرنجچی بەگی[١٦] نووسیوە: " تورکەکان لەڕووی شارستانییەوە زۆر لاوازن و توانای

---

[١٥] بەشێك لە سەرچاوەکان باسی ئەوە دەکەن گوایە ئەم نامیلکەیە لە بەیرووت بڵاوکراوەتەوە، بۆ نموونە بڕوانە: ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەڵاتی، چاپخانەی شڤان، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠١١، ل:٣١ بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەم نامیلکەیە لە بەیرووت نووسراوە بەڵام هەر وەك خۆیشی لە لاپەرە ٢٥ ی چاپی فرەنسەوەی ئەم کتێبەی خۆیدا نووسیوویە، نامیلکەکە لە قاهیرە چاپکراوە و لەسەر بەرگی نامیلکەکەش بە تورکی عوسمانلی نووسراوە لایەن (م.ع) بڵاوکراوەتەوە، بۆیە پێم وایە دەبێ قسەکەی خۆی زیاتر جێگەی متمانە بێت و نامیلکەکە لە قاهیرە بڵاوبووبێتەوە.

[١٦] فەیزی پیرنجچی بەگی کوری خالی زیا گۆك ئالپە کە سالانی ١٩٢٠ سێ جار بووە بە وەزیری ئاوەدانکردنەوە. ناوی باوکی عارف ئەفەندی و نوێنەری شاری ئامەد بووە. لە قۆناغی کۆماری تورکیادا کە بە تەواوەتی نکوولی لە مافی کوردەکان دەکرا فەیزی پیرنجچی زادە سەرومڕ خزمەتی بۆچوونەکانی کەمالیزمی دەکرد. بەڵام دواتر لە گفتوگۆیەکی تایبەتدا سەبارەت بە عیسمەت ئینەنۆ، ئەم ڕستەیەی گووتووە : "ئێمە لە کوێ بمانزانیبایە کە کەرێکی ئەوەندە خۆپەرست دەبێ". بۆچوونێکی تر سەبارەت بەو کەسە هەیە، نازانین تا چەند ڕاستیی تێدایە، ئەویش ئەوەیە کە فەیزی بەگ پێوەندی لەگەڵ جادی ئاختی "باقێ توژۆ" دا هەبووە کە لە دیاربەکر (ئامەد) لە سێدارە دراوە. ساڵی ١٩٢٥ لەسەروبەندی دادگاییکردنی شێخ سەعید و هاوڕێکانیدا، مولازم عارفی ئامەدی کە ژاندرمە بووە لە قسەکانی خۆیدا گوتوویە: حاجی ئاختی لە ئەنقەرە هاتوچۆی ماڵی فەیزی بەگی کردووە و بە کارتەکەی فەیزی بەگ چووەتە ناو کۆبوونەوەکانی پەرلەمان، دیسان لەڕێگەی فەیزی

ئەوەیان نییە کە کوردان بتوێننەوە. سەربەخۆیی مافێکی سروشتییە و مافێك نییە کە بدرێت تاوەکو هەوڵی وەرگرتنی بدرێت بەڵکو دەبێ هەبێت"[17]. سەگبان لە دوایین رۆژەکانی ساڵی ١٩٢٣ یاوەکو لە دەستپێکی ساڵی ١٩٢٤ دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا و تاوەکو حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٧ هەر لە بەغدا دەمینێتەوە و دواتر سەفەری پاریس دەکات و سەری بەرلین و برۆکسێل و لەندەنیش دەدات. لە پاریس پێوەندی لەگەڵ نوێنەرانی ڕووسەکان دەگرێ و داوای یارمەتییان لێدەکات بۆ شۆڕشی کورد. لە ئەورووپا ڕاستەوخۆ دەچێتە بەیروت بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی دامەزراندنی خۆیبوون کە لە (٥) ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٧ لە لوبنان بەسترا و وەك یەکێك لە دامەزرێنەرانی یەکەم کۆنگرەی دامەراندنی خۆیبوون ناوی هاتووە[18]. بەگوێرەی کونێ ڕەش لە کۆنگرەی خۆیبووندا دکتۆر محەمەد شوکری سەگبان وەکو چوارەمین کەسایەتی ناو کۆنگرەکە ناوی هاتووە و بەرپرسی ڕاگەیاندن و پێوەندییە گشتییەکانی پێ سپێردراوە[19].

---

بەگەوە توانیویە هەندێك بابەتی شەخسیی خۆی لە وەزارەتی داد بدۆزێتەوە و هەوڵی ئەوەی داوە مۆڵەتی وەکالەت وەربگرێ. بڕوانە: مالمیسانژ، *جەمعییەتی تەعاون و تەرەقیی کورد*، لەتورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەڵاتی، پێداچوونەوەی سدیق ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، لا: ٤٨-٤٩

[17] مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان* ١٩١٢-١٩٢٢ *(یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)*، ......هەمان سەرچاوە، لا: ١٢٧.

[18] *La Ligue national kurde Khoyboun*, Documents receillis, annotés et présentés par Jordi Tejel Gorgas, Etudes Kurdes, N° hors série III-juin 2007, Paris, p. 8

[19] کونێ ڕەش، جمعیة خویبون ١٩٢٧ و وقائع ثورة ارارات، منشورات موکریاني، اربیل، ٢٠٠٠، ص: ٤١

دوای کۆنگره دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا و بەگوێرەی سەرچاوە شۆفارییەکانی حکوومەتی فرانسا کە لەبارەی ناوی ئەندام و لقەکانی خۆیبوون، بۆ زانیاری خۆیان کۆیانکردۆتەوە، سەگبان دوای دامەزراندنی خۆیبوون لە بەغدا وەکو سەرۆکی لقی خۆیبوون لە بەغدا ناوی هاتووە[20].


کوردلر
تورکلردن نه ایستیولر؟
نافعه وکیلی و دیاربکر مبعوثی فیضی بکه
دوقتور شکری محمد بکلك برمکتوبی
طابع وناشری
م ۰ ع

ناميلكەی كوردەكان جيیان له توركەكان دەوێ

بەگوێرەی بەڵگەنامەیەکی نهێنی وەزارەتی دەرەوەی فرانسا بە مێژووی (٢٥) ی تەمووزی ١٩٣٢ دا هاتووە کە: "کۆمیتەی " خۆیبوون" چیدی لە عێراقدا لقی نەماوە، کە لەوەتای ساڵی ١٩٢٩-ەوە دەسەڵاتی خۆیبوون لە عێراقدا دانی پێدا نەنراوە. ئەو سەردەمانە لقێکی خۆیبوون بە چاودێریی دکتۆر شوکری محەمەد و مستەفا شەوقی ئەفەندی، (کۆنە ئەفسەری کورد) و ئیسماعیل ئەفەندی ڕەواندوزی (کە ئێستە لەناو ڕیزەکانی سوپای عیراقدا ئەفسەرە) هەبووە"[21].

سەگبان هەموو ژیان و تەمەنی خۆی لەپێناو پرسی کورد تەرخانکردبوو، لە هەموو دەرگایەکی دەدا بتوانێت لەو ڕێگەیەوە پرسی کورد بباتە پێشەوە.

---

[20] *La Ligue national kurde Khoyboun*, Documents receillis, annotés …..op.cit, p. 36

[21] ئەرشیفی وەزارەتی جەنگیی فڕانسا، کارتۆنی ژمارە [ 7N 4172 ] زانیارییە شۆفارییەکانی سەرکردایەتیی گشتیی سوپای فڕەنسی-بیرۆی دووەم لەبارەی کۆمیتەی خۆیبوون، ٢٥ی تەمووزی ١٩٣٢ .

لەسەروبەندی مۆرکردنی پەیماننامەی ئینگلیزی-عێراقی کە سەربەخۆیی دەوڵەتی عێراق لەبەرچاودەگرێ و هیچ گەرەنتییەکی بۆ کەمینەنەتەوەی کورد تێدا نەبوو، سەگبان و بڕێك سیاسەتوانی کورد لە سکاڵانامەیەك بۆ کۆمەڵەی گەلان نارەزایی خۆیان لەوبارەیەوە دەردەبڕن[22].


کورد مسئلەسی

صفحاتدن

دوقتور شکری محمد بك سکبانك ۱۹۳۳ سنه سنده

پارسدە نشر ایتمش اولدیغی La question Kurde

عنوانلی فرانسزجە رسالەسنی رد وتنقید

محرری

رفیق حلمی

بصره ثانویه سنده فرانسزجه وریاضیات مدرسی

وطن مطبعه سنده طبع ایدلمشدر

ناميلكەی كورد مسئلەسی صفحاتن

ئەم خەباتکارە گەورەیەی کاروانی دوورودرێژی کوردایەتی، دوای تێکشکانی شۆڕشی ئارارات لەساڵی ۱۹۳۰-۱۹۳۱ کە خۆیبوون سەرکردایەتی دەکرد بە یەکجاری ورەی دەڕووخێ و ئیدی هیچ باوەڕێکی بە سەرکەوتنی شۆڕشی کورد نامینێت و لەژێر فشاری سیاسەتیی دژە کوردانەی حکوومەتی عێراق دوای ئەوەی عێراق سەروەری سیاسیی خۆی بەدەستەوە دەگرێت (۱۹۳۲) سەگبان بەرەو ئەوروپا دەڕوات بۆ چارەسەری نەخۆشی دەردەباریکە و لە ئەڵمانیا داخیلی نەخۆشخانە دەبێت. بە هەموو پێوانەکان وا دیارە بە درێژەی ساڵی ۱۹۳۲-۱۹۳۳ هەر لە ئەڵمانیا ماوەتەوە. وا دیارە لە نەخۆشخانە لەژێر فشاری باری ناساغی نەخۆشی دەردە باریکە و تێکشکانی شۆرشی کورد ئیدی هیچ ئاسۆیەك بۆ سەرکەوتنی کورد بەدی ناکات و ئەم کتێبە بە فرەنسی دەنووسێ کە لێرەدا کراوە بە کوردی. دوای دەرچوونی لە نەخۆشخانە سەری پاریس دەدات و لە پاریس لە چاپکراوەکانی

[22]Martin Strohmeier, *Crucial images in the presentation of a Kurdish national identity : heroes and patriots, traitors and foes, Social, economic and political studies of the Middle East*; 86, Leiden : Brill, 2003, p. 117

چاپەمەنی زانکۆیی فرانسی بە زمانی فرەنسی نامیلکەی (پرسی کورد: کێشەگەلی کەمینەنەتەوەکان) کە لێرەدا کراوە بە کوردی بە فرانسەوی بڵاودەکاتەوە. بەگوێرەی مارتین شترۆمییێر سەگبان لە نیسانی ١٩٣٤ گەڕاوەتەوە بۆ عێراق[23]، بەڵام بەگوێرەی ئەو پێشکەش کردنەی کتێبەکەی بێت، کە لە بەغداوە پێشکەش بە جەنەراڵ شەریف پاشای کردووە و ڕێکەوتی ٢١ ی شوباتی ١٩٣٤(بەغدا) ی بەسەرەوەیە، دەبێ سەگبان لە ئاخروئۆخری ١٩٣٣ یان لە دەستپێکی ١٩٣٤ گەڕابێتەوە بۆ عێراق.



ڕەفیق حلمی

سەگبان لەم کتێبەدا خەتێکی ڕاست و چەپ بەسەر مێژووی (٣٧) ی ساڵەی خەباتی کوردایەتی خۆی دادەهێنێ و زۆر بەداخەوە لەم کتێبەدا بە مەبەستی تایبەتیی خۆی هەر تەنیا بۆ ئەوەی تورکەکان ڕێگەی گەڕانەوەی بدەن بۆ تورکیا نەك هەر بە نووسین خەتێکی ڕاست و چەپی بەسەر هەموو مێژووی خۆیدا هێنا بەڵکو زیاد لەوە زۆربەی ڕاستییە مێژووییەکانیشی ئاوەژۆ کردۆتەوە هەر تەنها بۆ ئەوەی کەمالیستەکان بیبەخشن و بگەڕێتەوە تورکیا.

دوای بڵاوبونەوەی ئەم کتێبە بە فرەنسەوی، هاوڕێ و دۆستە نزیکەکانی کاروانی کوردایەتی زۆر بە توندی بەرپەچی ئەم نامیلکەیان دایەوە. یەکێك لەوانە ڕەفیق حیلمی ( 1898-١٩٦٠) بوو کە زوو ساڵی ١٩٣٥بە نامیلکەیەك بە زمانی تورکی

---

[23] Martin Strohmeier, *Crucial images in the presentation of a Kurdish national identity : heroes and patriots, traitors and foes*, …op.cit, p.117

به ناوی (کورد مسئلەسی صفحاتن- لە لاپەڕەکانی پرسی کورد-ەوە)[24] وەڵامی دایەوە و زۆر بە توندی هێرشی کردە سەر و ڕەخنەی لەم کارە گرت: "*ئەو تێبینیانەی لە یەکەم خوێندنەوە لە لام دروست بوون، تا چ ڕادەیەك ئاڵۆز بوو لە توانامدا نییە و پێناسەم پێ ناکرێ. گوێیەکانم وەك بڵێی دەزرینگانەوە، عەقڵم واتاکانی ئەو وشانەی چاوەکانم دەیانبینین پێ قبوول نەدەکرا. بەڵام نامیلکەکەم سەراپا و زۆر بە وردی خوێندەوە و دوای ئەوەی بە دووروودرێژی لێ رامان ئەنجامێکی هەرگیز ئومێد بەخشم لێ بەدی نەدەکرد. بەڵێ بە تەواوی مخابنەوە دەڵێم کە دکتۆر —لەژێر هەر مەبەستێکدا دەبێ با ببێ- بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن لە ڕاستی لای داوە و ویستوویەتی بە ئانقەست بوختان بە مێژوو بکا، گەیشتمە ئەنجامی پڕ لە مخابن لە کاتێکدا بە تەمای ئەوە بووم سوود لە توانستی بڵیندی وەربگرم. لەگەڵ هەست بەوە کردندا کە ناچارم بەناوی مێژوو و ڕاستییەوە ڕەتی بکەمەوە و ڕەخنەی لێ بگرم دەستم بە ئازار چەشتن کرد*".[25]

بە هەمان شێوە، مەمدوح سەلیم (١٨٨٠-١٩٧٦) یش لە نامەیەکدا کە ساڵی ١٩٣٤ لە ئەنتاکیاوە بۆ جەلادەت بەدرخانی ناردووە زۆر بە توندی دژی بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبۆلکەیە دەوەستێ :

"*ئەو کتێبۆلکەیەم کە شوکری سەگبان لە فەرنسای لە چاپ داوە، بەدەست کەوت، دیارە دەبێ بەدەست ئێوەش گەیشتبێ. دکتۆر ئەم کتێبەی هەروا لە قەیرانێکدا، لە*

---

[24] رفیق حلمی، کورد مسئلەسی صفحاتن، ١٩٣٥، (٨٥ ص). ساڵی ١٩٥٤ نووسیاری کتێبەکە خۆی نامیلکەکە دەکات بە عەرەبی و بە زنجیرە لە ڕۆژنامەی عەرەبی (الايام) بڵاوی دەکاتەوە و پاشان ساڵی ١٩٥٦ وەکو کتێبێکی سەربەخۆ هەر لە بەغدا بڵاوی دەکاتەوە، بڕوانە: رفیق حلمی، مقالات، بغداد، ١٩٥٦، (٨٠ ص).

[25] ڕەفیق حیلمی، "لە لاپەڕەکانی دۆزی کوردەوە"، وەرگێڕانی لە تورکی عوسمانلییەوە : ئەحمەد تاقانە، گۆڤاری (واتە)، ژمارە ١٦، تشرینی دووەمی ٢٠١١، لا: ١٢١

*پڕ، یا وردە-وردە، هەرچیەك بێ، ناشێ بەتەواوی هۆش ئاووەزییەوە نووسیبێ و بڵاوی کردبێتەوە. دکتۆر دەڵێ لە سیاسەت و سیاسەتکاری دەکشێمەوە.، بەڵام ئەمە کشانەوە نییە، خۆکوژییە. بریا لەتاو دەردەست نەکردنی ئەم مەبەستەی کە تا ئێستا لە دووی هەڵوەدابوو و ئەم سەر و ئەوسەری بۆ دەکرد، خۆی کوشتبا..، ئەمن نازانم داخۆ تێ سرواندنێکی ئەوها گووچکبڕ لە سیاسەتی نەتەوەکەیدا نازانم پێویست بوو؟! ئەمە جۆرە سادەلەوحییەکە، لە خۆو لە برادەرانی هاوسەنگەر بەدەست دژمنەوەدان بەو لاوە دەبێ چی دیکە بێ؟ خولاسە کارەکە شتێکی تا بێژی دزێو و قێزەونە، پێویستە بیر لە چارەسەرێك بۆ غایەنەتییە یەك لە دوو یەك و تەوس و ئابرووبەرەکانی بکرێتەوە"*[٢٦].



جەلادەت بەدرخان

سەگبان خۆی ئەوە دەگێڕێتەوە، کە دوای بڵاوکردنەوی کتێبی (پرسی کورد) لە فرانسا بە فرەنسی، هاوڕێکانی زۆر لێی دڵگران بووبوون. "لەکاتی گەڕانەوەمدا لە شام لەگەڵ جەلادەت بەدرخان پێکەوە ویستمان خواردنێك بخۆین. خواردنێکی عەرەبەکانیان بۆ هاوردین کە ئێمە نەماندەزانی چییە. وتم جەلادەت بەگ! ئەمە چ خواردنێکە ؟ وتی: (دوکتۆر! ئەمە باینجانە بەڵام تۆ ئەتوانی پێی بلێی کوولەکە) تێگەیشتم کە جەلادەت بەگ مەبەستی نامیلکەکەی من بوو. دواتر ڕەخنەی زیاتری لێگرتم و بەوە تۆمەتباری کردم کە گوایە

[٢٦] ڕۆهات ئالاکۆم، *خۆیبوون و شۆڕشی ئاگری*، شوکور مستەفا کردوویە بە کوردی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠، لا : ٨٥

من لەبەر ژنەکەم کە دڵی بۆ ئەستەموڵ تەنگ بووە ئەو کتێبەم نووسیوە و تاقە ئامانجیشم ئەوەیە کە ئەتاتورك لێبوردنم بۆ دەربکات. بەڵام، سوێند دەخۆم کە شتی وەها لەئارادا نەبوو"[٢٧].


موسا عەنتەر

محەمەد شوکری سەگبان لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ مووسا عەنتەر، بەم جۆرە هۆی نووسینی ئەم کتێبەی بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە بە قسەی سەگبان خۆی"ئەم نامیلکەیە بۆ ئەو بۆتە مایەی شەرمەزاری" ئاوها مەسەلەکە بۆ موسا عەنتەر دەگێڕێتەوە:

"لەساڵی ١٩٢٥دا کوردستان بێخاوەن مابوویەوە. هەموو جۆرە زوڵم و ستەمێك لە کوردان دەکرا، سەرەڕای ئەوەش ئەورووپا و دنیای ئیسلامەتیش دەنگیان لێوە نەدەهات و تەنانەت بچووکترین نارەزایەتیشیان پیشان نەدەدا. هەموو شتێك بەدەستی حوکمەتە فاشیستەکەی ئەنقەرەوە بوو. ئێمەش لە دەرەوە هیچمان پێنەدەکرا. لەڕاستیدا ئەو شتانەی (و: جووڵانەوەی کورد) کە تورك بە ڕاپەڕین و حەیسیات لەقەڵەمیان دەدا کاردانەوەیەك بوو لە بەرامبەر جێبەجێنەکرانی ئەو بەڵێنانەی کە مستەفا کەمال بە کوردانی دابوو. چونکە کورد وایاندەزانی لەدەستی دەسەڵاتی غەدار و خوێنخواری ئیتیحاد و تەرەقی و پادشاکانی عوسمانی ڕزگاریان بووەو پێویستە ئیدارەی کۆماری تورکیا بەشێوەیەکی مرۆڤدۆستانە ڕەفتاریان لەگەڵدا بکات. بەڵام بە پێچەوانەی

---

[٢٧] مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان* ١٩١٢-١٩٢٢ *(یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)*، ......هەمان سەرچاوە، لا:١٣٠

چاوەڕوانییەکانی ئەوان ئیدارەی کۆماری تورکیا زەختو گوشارێکی زیاتری خستە سەر کورد.

من نوری سەعید پاشام لە ئەستەمووڵ ناسیبوو، ناوبراو لەکاتی دەسەڵاتی مەلیك فەیسەڵی یەکەمدا کابینەی حکوومەتی پێکهێنا و منیشی کردە وەزیری تەندروستی. پێدەچێ بەهۆی خەموخەفەتەوە بووبێ کە هەر لە سەرەتاوە توشی نەخۆشی وەرەم بووم و لاواز بووم. بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەم سەردانی ئەڵمانیام کرد. لەوێ بیرم کردەوەو وتم: کورە خۆ ئەم بەرپرسە گێلوگەوجانەی ئەنقەرە هەموو دنیا بە تورك دەزانن با منیش بڵێم کوردەکانیش لە ڕەگەزی تورکن بەڵکو تۆزێك زوڵموستەمی کەمتریان لێبکرێت. لە نەخۆشخانەدا هەموو ئەمانەم لەسەر کلێنێکس نوسی و دوای دەرکەوتنم لەوێ لە چاپخانەی زانکۆی سۆربوونی فەرەنسادا چاپم کرد)[٢٨]. دواتر موسا عەنتەر لە کتێبی بیرەوەرییەکانی خۆیدا بەشێك لە قسەکانی (د. سەگبان)ی وەکو خۆی ڕاگوێزاوەتەوە:

"*ئەفەندم! لە ساڵەکانی ١٩٣٠ یەکاندا کەمال پاشا و حکوومەتی ئەنقەرە هەوڵی تواندنەوەی نەتەوەیی کوردیان دەدا، دەسەڵاتی ڕەسمی و ڕاگەیاندنی تورکیا بە هاوکاریی یەکتری بۆچوونێکی پێکەنیناوییان سەبارەت بەوەی کە گوایە (کورد تورکە) بڵاو دەکردەوە. لەلایەکی تریشەوە وەکو ئەوەی کە گەلە گورگێك هێرش بکاتە سەر ڕانەمەڕێکی بێشوان هەوڵی ڕەشەکوژی و پاکتاوی نەژادی کوردیان دەدا. منیش یەکێك بووم لەو ١٥٠ کەسەی کە ئاتاتورك بە خاین ناوزەدی کردبوون. پەنام بۆ نوری سەعیدی سەرۆك وەزیری عێراق برد. ئەویش منی کردە وەزیری تەندروستی[٢٩] بەڵام لە*

---

[٢٨] مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢ (یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)*، ......هەمان سەرچاوە، لا:١٢٨-١٣٠

[٢٩] وەك مارتین شترۆمێیر بەدواداچوونی وردی بۆ کردووە، سەگبان بەهیچ شێوەیەك وەزیر نەبووە، بگرە لەو سەردەمە وەزارەتێك بەناوی وەزارەتی تەندورستییەوە لە عێراقدا بوونی نەبووە، دەشێ

*ئەنجامی ئەو هەموو خەفەتەی کە دەمخوارد توشی وەرەم بووم. لە نەخۆشخانەیەکی پێشکەوتووی ئەڵمانیا بەردەوام ئەم ڕووداوە درندانەیان دەگێڕایەوە کە لە تورکیا ڕوویان دەدا. بیرم کردەوە: ئەگەر بڵێم کوردەکانیش تورکن لەوەدەچێ مستەفا کەمال، کە حەز لەو جۆرەشتانە دەکات، واز لە قەتڵوعامی کوردەکان بهێنێ. ئەو کتێبە درۆینە و پڕوپوچەشم بەو بۆچوونەوە نووسی"* [30] .

دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا و لە خولی حەوتەمی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق ( ٢٧ ی شوباتی ١٩٣٧-٢٦ ی ئابی ١٩٣٧) وەکو نوێنەری لیوای هەولێر [31] هەڵبژێردراوە. ساڵی ١٩٣٩ لەسایەی نووسینی ئەم کتێبەوە تورکەکان ڕێگەی پێدەدەن بگەڕێتەوە بۆ تورکیا و لەوێ وەکو پزیشك کاردەکات. ساڵی ١٩٤٦ حیزبی کرێکاران و جوتیارانی تورکیا پێك دەهێنێ. سەگبان تا ساڵی ١٩٦٠ هەر لە تورکیا دەمینێتەوە و دواجار ڕۆژی ٨ ی ئایاری ساڵی ١٩٦٠ لە ئەستەموولّ بە یەکجاری ژیانئاوایی دەکات.

بەرهەمەکانی چاپکراوەکانی:

---

سەگبان پۆستێکی هاوشێوەی وەزیر یان بەرێوەبەری گشتی یان پۆستێکی لەوشێوەی تەندورستی بوویێت، کە ئەو دەم سەر بە وەزارەتی ناوخۆ بووە، بڕوانە:

Martin Strohmeier, *Crucial images in the presentation of a Kurdish national identity : heroes and patriots, traitors and foes….op.cit*, p.١١٦

[30] موسا عەنتەر، بیرەوەرییەکانم، بەرگی ٢، بڵاوکراوەکانی یۆن، ئەستەنبوڵ، ١٩٩٢، ل٢٤. لە: مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢ (یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)* ......هەمان سەرچاوە، لا: ١٣٠-١٣١ ڕاگوێزراوەتەوە.

[31] ئەحمەد حەمەد ئەمین هۆمەر، *ئەندامە کوردەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا (١٩٢٥-١٩٥٨)*، هەولێر، ٢٠٠٠، لا: ٣٢-٣٣

١-*نامیلکەی کورد چییان لە تورك دەوێ*، قاهیرە، ١٩٢٣، (٢٣ لاپەرە).

٢- زنجیرە وتاری (*یکی اسلام عالمندە ملیت جریانلری*) بە زمانی تورکی عوسمانلی، گۆواری (دیاری کوردستان)، بەغدا، ١٩٢٥، ژ: ٣، ب:١، لا: ٢٢-٢٣.، ژ: ٥، ب:٢، لا: ٢٢-٢٣.، ژ ٦، ب:٣، لا: ٢٢-٢٣.، ژ: ٧، ب: ٤، لا: ٣٧-٣٨.، ژ: ٨، ب:٥، لا: ١٧-١٨.، ژ: ١٠، ب:٦ لا: ٢٥.، ژ:١١-١٢، ب: ٧، لا: ٣٠-٣١.، ژ١٣-١٤، ب:٨، لا: ٣٤-٣٦.، ژ١٥، ب:٩، لا:١٩-٢١.، ژ: ١٦، ب:١٠، لا: ١٩-٢١.

٣-*La question kurde: des problèmes des minorités*, Paris: Les Presses Universitaires de France, 1933, (41p)[32]

٤-*İlk devirlerinde frenginin Pyréto*-*chimio-thérapie ile tedavisi* = le traitement de la syphilis primo-serondaire par la pyréto-chimiothérapie, İstanbul, 1943, (7p).

5-*Trombositlerin teşekkülü hakkında* = A propos de la formation des trombocytes, Türk Tıp Cemiyeti Mecmuası, cilt 10 no.12-1943'den ayrı baskı, [İstanbul : yayl.y.], 1943, (8p).

6-"*A propos de la suppression totale de la blennorragie et de la syphilis par la thérapeutique moderne*", Modern tedaviyle belsoğukluğu ve frenginin ortadan büsbütün, kaldırılmasına dair, Dokuzuncu Millî Türk Tıp Kongresine serbest tebliğ, İstanbul, 1946, (7p).

---

[٣٢] *پرسی کورد: کێشەگەلی کەمینەنەتەوەکان*، لە بڵاوکراوەکانی چاپەمەنی زانکۆیی فرانسا، پاریس، ١٩٣٣، (٤١ لاپەرە)، ئەمە وەرگێڕانی ئەم کتێبەی بەردەستانە، (وەرگێر).

# سەرچاوەکان

1-Hamit Bozarslan, Le problème nationale kurde en Turquie kémaliste. Mémoire de DEA de l'E.H.E.S.S, Paris, 1986.

2-Bilal N. Şimşir, Kürtçülük 1924-1999, Ed. Verlag Bilgi Yayınevi, Ankara, 2009.

3-Jordi Tejel Gorgas, Le mouvement kurde de Turquie en exil: continuités et discontinuités du nationalisme kurde sous le mandat français en Syrie et au Liban, 1925-1946. P. Lang, 2007.

4-La Ligue national kurde Khoyboun, Documents receillis, annotés et présentés par Jordi Tejel Gorgas, Etudes Kurdes, N° hors série III-juin, Paris, 2007.

5-Ugur Ümit Üngör, The Making of Modern Turkey: Nation and State in Eastern Anatolia, 1913-1950, Ed. Oxford University press, 2011.

6-La question kurde: des problèmes des minorités, Paris: Les Presses Universitaires de France, 1933.

7- Nader Entessar, Kurdish Politics in the Middle East. Rev. ed. - Lanham, MD : Lexington Books, 2010.

8-Martin Strohmeier, Crucial images in the presentation of a Kurdish national identity : heroes and patriots, traitors and foes, Social, economic and political studies of the Middle East; 86, Leiden : Brill, 2003.

9-ئەرشیڤی وەزارەتی جەنگیی فڕانسا، کارتۆنی **ژمارە** [ 7N 4172 ] زانیارییە شۆفارییەکانی سەرکردایەتیی گشتیی سوپای فڕەنسی-بیرۆی دووەم لەبارەی کۆمیتەی خۆیبوون، ٢٥ی تەمووزی.١٩٣٢

10-ئیسماعیل گوێڵداش، جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەلاتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠١١

11-ڕەفیق حیلمی، "لە لاپەڕەکانی دۆزی کوردەوە"، وەرگێڕانی لە تورکی عوسمانلییەوە : ئەحمەد تاقانە، گۆڤاری (واتە)، ژمارە ١٦، تشرینی دووەمی ٢٠١١، لا: ١٢١

12-ڕۆهات ئالاکۆم، *خۆیبوون و شۆرشی ئاگری*، شوکور مستەفا کردوویە بە کوردی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠، لا : ٨٥

13-ئەحمەد حەمەد ئەمین هۆمەر، ئەندامە کوردەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی لە ڕۆژگاری پاشایەتیدا (١٩٢٥-١٩٥٨)، هەولێر، ٢٠٠٠

14-مالمیسانژ، جەمعییەتی تەعاون و تەرەقیی کورد، لەتورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەلاتی، پێداچوونەوەی سدیق سالح، لە بلاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، .٢٠٠٧

15-مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢ (یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)*، لەتورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەلاتی، پێشەکی و پێداچوونەوەی عەبدوڵلا زەنگەنە، لە بلاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، .٢٠٠٧

16-کونیێ ڕەش، جمعیه خویبون ۱۹۲۷ و وقائع ثورة ارارات، منشورات موکریانی، اربیل، ۲۰۰۰

17-زنار سلوثي، في سبيل كردستان (مذكرات)، ترجمة ر.علي، منشورات دار رابطة كاوا- بيروت، ۱۹۸۷.

۱۸- قەتڵوعامی کورد لە تورکیا، لەفڕانسییەوە وەرگێڕانی، پێشەکی و پەراوێزنووسیی دکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵا، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ۲۰۰۸.

Dr. CHUKRU MEHMED SEKBAN

# LA QUESTION KURDE

## *DES PROBLÈMES DES MINORITES*

LES PRESSES UNIVERSITAIRES DE FRANCE
*49, Boulevard Saint-Michel, 49*
PARIS

بەرگی ناوەوەی کتێبەکە بە زمانی فەرەنسایی چاپی پاریس ١٩٣٣

Pour avoir une idée exacte et ensuite porter un juste jugement sur ce que je vais avancer, je crois qu'il faut esquisser une analyse sommaire de l'histoire du peuple kurde.

Les études récentes et les dernières découvertes archéologiques nous démontrent que les Kurdes habitent les contrées que nous avons l'habitude d'appeler le Kurdistan depuis 5.000 ans.

En effet, d'après le Prof. Speiser, une inscription archéologique découverte à Zéhave, près de Sulaymanieh, en Iraks et appartenant au roi de Lullu, au nom de Anno-Banini, démontre l'existence des Kurdes « Gutti » dans cette contrée en 1800-1900 av. J.-C.

Deux autres pierres de seuil summériennes datant de vingt siècles av. J.-C. affirment la présence des Kurdes « Kardaka » dans le Kurdistan actuel (Thureau-Dangin).

Sur une autre pierre archéologique découverte par le Major C.-J. Edmonds au défilé de Derbendigaver, près de Kara-Dagh (Sulaymanieh), des détails de la guerre des Lullu (royaume des Kurdes)

**رووپەڕی لاپەڕەی ٨ی کتێبەکە بە فرەنسایی**

# کێشەگەلی کەمینەنەتەوەکان

یەکێك لەو فاکتۆرە سەرەکییانەی ئەو تەنگژە جیهانییەی کە لەوەتای کۆتایی جەنگی جیهانییەوە سەرلەبەری جیهانی پێدا دەڕوات، بێگومان ئەو نیگەرانی و سەرگەردانییەیە کە بەرەو ڕووی کەمینەنەتەوەکان دەبێتەوە کە لە چەندین وڵاتی جیاجیادا دانیان پێدانراوە. جا ئەوەی کە هاریکار دەبێ لەوەی چارەسەرێکی ڕازیکارانە بۆ تەواوی یان بەشێکی کێشەی کەمینەنەتەوەکان بدۆزێتەوە بێگومان ئەنجامی قەبوولکراوی دەبێ لەسەر پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان و لە ئەنجامیشدا بۆ سەر تەنگژەکە خۆیشی.

بەو پێیەی کە لە نزیکەوە لە چەندین لایەنی هەمەچەشنەی کێشەی کورد ئاگەدارم، دەمەوێ هەوڵبدەم بۆ ئەوەی چارەسەرێکی لە هەمووان عەقلانیتری بۆ بدۆزمەوە. بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکی تەواومان ببێ و دواتر حوکمێکی ڕەوا لەسەر ئەوە بدەین کە پێشکەشی دەکەم، پێم وایە دەبێ سەرەتا دەست بکرێ بەوەی شیکردنەوەیەکی کورتە باسێکی مێژوویی گەلی کورد باس بکرێ.

لێکۆڵینەوە نوێیەکان و دواین دۆزینەوە ئارکیۆلۆژییەکان ئەوەمان پێ نیشان دەدەن، کە کورد لەوەتای (٥٠٠٠) ساڵ دەبێ لەو دەروناوچانە ژیاون، کە ئێمە ڕاهاتووین لەسەر ئەوەی بە کوردستان ناویان ببەین. ڕاستییەکەی بەگوێرەی پرۆفیسۆر سپایسەر*، ئەنجامی هەڵکۆڵینە ئارکیۆلۆژییەکانی زەهاو کە لە نزیك سلێمانی لە عێراقدا دۆزراونەتەوە و هی

* Prof. Speiser

پاتشای لۆلۆکانه به ناوی ئانوو-بانیی، هەبوونی کوردانی "گۆتی" لەم ناوچەیە لە ساڵەکانی ١٨٠٠-١٩٠٠ ی پێش زایین دەسەلمێنێ.

دوو بەردی دیکەی سەرتای سۆمەری کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ بیست سەدە پێش زایین، دووپاتی بوونی کورد "کارداکا"* لە کوردستانی ئێستەدا دەکەنەوە[٣٣]. لەسەر بەردێکی دیکەی ئارکیۆلۆژی کە لە لایەن مێجەر س.ژ. ئەدمۆندز لە دۆڵی دەربەندی گاور**، لە نزیك قەرەداغ (سلێمانی) دۆزراوەتەوە، وردەکاری جەنگی لۆلووەکان (شانشینی کوردان) دەگێڕێتەوە کە لەگەڵ ئەکەدییەکان لەژێر سەرکردایەتی نەرامسینی پاشای ئەکەدییەکان، جێگرەوەی سەرگۆن پاشای بەناوبانگ، لە ٢٨٠٠ ساڵ پێش زایین تۆمارکراون[٣٤].

---

* Kardaka
33(Thureau-Dangin).

فرانسوا تۆرۆ-دەنگین (١٨٧٢/١/٣-١٩٤٤/٢/٢٤). ئاسووریناس، ئارکیۆلۆگ و سۆمەریناسی فرەنسییە. پسپۆری بوارگەلی لێکۆڵینەوەی سۆمەری و ئەکەدییە. لە ساڵی ١٨٩٥ ەوە لە مۆزەخانەی لۆڤەر کاریکردووە و بایەخی بە نووسینی بزماری داوە. لە ساڵی ١٩٢٥ەوە بواری لێکۆڵینەوەکانی بردۆتە سەر لێکۆڵینەوە سۆمەری و ئەکەدییەکان لە دەورانی هەرەکۆنەوە تاوەکو هەزارەی دووەمی پێش زایین. لە ساڵی ١٩١٧ ەوە ئەندامی ئەکادیمیای نەخشەسازی و ئەدەبیاتی فرەنسییە و سەرۆکی بەشی ڕۆژهەڵاتیی کۆنی مۆزەخانەی لۆڤەر بووە. نووسەری چەندین لێکۆڵینەوەی زانستییە لەبارەی مێژووی کۆنی مێزۆپۆتامیا لە دەورانی سۆمەری کۆنەوە تاوەکو دەورانی یۆنانی، وەرگێڕ

** Derbendigaver
34 *Archéologie dans le Kurdistan. Geographie Journal*, Major C.-J.Edmonds

مەبەستی نووسەر ئەم وتارەی ئیدمۆندزە، کە لەم سەرچاوەیە بڵاوکراوەتەوە:

لەماوەی نێوان دەورانی نیشتەجێبوونی کوردەکان لەو دەر و ناوچانەی ئێستەیاندا و داگیرکردنی وڵاتەکەیان لە لایەن میدییەکانەوە، نزیکەی ماوەی دوو هەزار ساڵ لەگەڵ ئاشوورییەکاندا لە شەڕدابوون. میدییەکان ئەو گەلە ئارییەی، کە لە باشوور-ڕۆژهەڵاتی زەریای خەزەر پەڕیووە بوون لە (سەدەی نۆیەم —سەدەی دەیەمی پێش زایین) هاتوون کوردستانیان داگیرکردووە و ئیمپراتۆریایەکیان دروستکردووە کە ناوەندەکەی کوردستان بووە. مادەکان لە دەورانی دەسەڵاتداری خۆیاندا هەمیشە لە جەنگێکی بەردەوامدا بوون لەگەڵ ئاشوورییەکان. دواجار چۆکیان بە ئاشوورییەکان دادا و خستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و بە وڵاتی مێدیایان وەلکاند.

دواتر، میدییەکان لە ساڵی ٥٥٦ ی پێش زایین لە لایەن فارسەکان داگیرکران، کورد بەوەی، وەکو هاوبەش یا وەکو بەکرێگرتە لە ڕیزی سوپای فارس ئالیکاریان کردووە بڕێك سەربەخۆیی خۆیان پاراستووە و بەشداریشیان لە گەورەکردنی ئیمپراتۆریای فارسدا کردووە. پێکەوەژیانی کورد و فارس تاوەکو ڕووخانی ئیمپراتۆریای فارسی لە ساڵی ٦٥٢ هەر بەردەوام بووە. بوونی کورد لە کوردستان بەر لە هێرشی میدییەکان لە ڕێگەی ئەو بەردە ئارکیۆلۆژیانە سەلمێنراوە کە ڕوناکییەکی تەواو دەخەنە سەر بنچینەی گەلی کورد.

ڕاستییەکەی، کوردەکان بەر لە دامەزراندنی شانشینی ماد کە کورد پێی وایە نەوەی میدییەکانن ئاگاداری سەروکاری مێژووی خۆیان نین. وەك چۆن ئەوەی میدییەکان ئاری بوون، کوردەکانیش خۆیان بە ئاری دادەنێن. باوەڕی میللیی بەوەی گەلی کورد لە بنچینەی ئاری بن، هەروەها بڕێك لە زانا ئەورووپی و ئەمریکایەکانیش بیروڕای جیاوازیان هەیە کە نایانەوێ تەنها لەو نوختە خاڵەوە لە مێژووی گەلی کورد بکۆڵنەوە.

---

Cecil John Edmonds, « Two ancient monuments in southern Kurdistan », In: The Geographical Journal. 65. 1925, pp. 63-64.

بەڵام بەدەر لەو سەرگوزشتە مێژوویانەی کە جێنشینبوونی گەلی کورد لە هەرێمی ئێستەیاندا دەگێڕنەوە بۆ زیاتر لە ٢٢٠٠ ساڵ پێش گەیشتنی میدییەکان بۆ وڵاتەکەیان، بەڵگەنامە ئارکیۆلۆژییەکان ئەوە دەسەلمێنن کەوا میدییەکان بە پێچەوانەی باوەڕی هەڵەی کوردەکان، حاکمڕانی ئەوان نەبوون، بەڵکو تەنها چەند غەوارەیەك بوون کە لە سۆنگەی ڕێکخراوە نایابەکانیان، ئەوان ئەو کوردانەیان خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و ئیمپراتۆریای مادیان دامەزراندووە کە لەلایەن کوردەکانیشەوە پشتگیری کراون. ئێستە دەزانین کە میدییەکان تەواو ١٨٠٠ ساڵ دوای ئەوەی کە کوردەکان جێنشین بوون هاتوون.

کەوابوو، لەبەر ڕوناکی ئەم ڕاستییە تەواو زانستییانەدا، کوردەکان بەهیچ شێوەیەك ئاری نین و بەهەمان شێوە سامی یش نین. کوردەکان بەگوێرەی بانگەشەی بڕێك لە زانا ئەڵمانەکان لە بنچینەی تۆرانین. ڕاستییەکەی، ئەگەر نیازمان بێ لە نەخشەی جوگرافی ئێستە بکۆڵینەوە دەتوانین لەسەر ئەو نەخشەیە بە ئاسانی بەشوێن ڕێچکەی پەرت و بڵاوی گەلی کورد لەناو ئاسیا دا بچین، بە ئاسانی دەتوانین بگەینە ڕاستی و دروستی ڕاست ڕوانینی نووسەرە ئەڵمانەکان.

نەخشەی هەرە نوێ و لە هەمووان بەدەستاوێژتر ئەوەی نووسەری خولاسەیەکی مێژووی کورد و کوردستانە و یەکەم بەرگی ساڵی ١٩٣١ بڵاوکرایەوە.

بە بەدواداچوونی دابەشبوونی کورد لەسەر ئەم نەخشەیە، تێبینی ئەوە دەکرێ کە کوردەکان لە ئاسیای ناوەڕاست، لە دەوروبەری پێدەشتی قەرەقووم بە دوو ئاڕاستەوە دەرچووبن. لە لایەك، بەرەو باشوور هاتوون و ئەفغانستان یان بڕیووە و لەوێدا گروپێکیان لەژێر شێوەی کۆمەڵە ماڵێك لە نزیك هیرات بەجێهێشتووە، پاشان لە نزیك بلوجستان ژمارەیەکی هەرە زۆریان لە دەوروبەری خەلات بەجێهێشتوون. پاشان ئەم ڕەتلە بەرەو ڕۆژئاوا، بە کەناری زەریای عوماندا ڕۆیشتوون و بۆ خۆیان لە بەندەر عەباس جێگیربوون. گروپێکی چکۆڵە لێیان جیابووەتەوە و لە نزیك کرمان نیشتەجێ بووە.

ئەوانەی کە لە سەروبەندی دەرچوونیان بە ئاڕاستەی ڕۆژئاوا دەرچوون، ئاپۆرەی باکووری ئێرانی ئێستەیاندا بە شێوەی چەند ماڵیی هۆزە کوردییەکان لە نزیك مەشهەد

لەنێوان تەهران و زەریای خەزەردا بەناو سەرووی ئەوچیایانەدا چوون، کە بە کەناری زەریای خەزەرەوەن، تاوەکو سنووری باشوور-ڕۆژئاوای قەوقاز. لەوێوە لە لایەکەوە بە کۆمەڵێیەکی هاوڕگەز هەڵکشان و هەمیشە زنجیرە چیاکانی ڕۆژئاوای ئێران یان وەکو شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆیان وەرگرتبوو تا گەیشتنە بەندەر شەهر لە کەنداوی فارس، لەکاتێکدا بەشەکەی دیکەیان، ئەو گەلانەی کە لە دەروناوچەکانی کوردستان جێگیر بوون، بۆ هەمیشەیی لەناوچە چیاییەکانی ئەدەنە و دەروبەری ئەنقەرەدا جێگیر بوون.

وادیارە کوردەکان لە سۆنگەی شیمانەیەکی زۆرەوە لەبەر خراپی ڕەوشی ئاو وهەوا نەیانتوانیووە لە ئاسیای ناوەڕاستدا بژین و دەستیان کردووە بەوەی بە ئاڕاستەی زنجیرە چیاکاندا بڕۆن بۆ خۆپاراستنیان لەدەست پەلاماری ئاسانی گەلانی دیکە و چوون ئەو دەروناوچانەیان هەڵبژاردووە کە ئێمە وا لەم کتێبەدا نەخشەکەی دیاری دەکەین.

گومانی تێدا نییە کە شاڵاوە هەمەچەشنە و زۆر و زەوەندەکان، دەست بەسەرداگرتنی کورد بەسەر گەلانی تر و دەست بەسەرداگرتنی گەلانی تر بەسەر کورد، قات و قڕی، نەخۆشی پەتا بە قووڵی ڕەوشی ڕەسەنایەتی جوگرافیایی ئەم گەلەیان گۆڕیووە، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە هیچ هێرشێك کوردەکانی لە شوێنی خۆیان هەڵنەقەڵاندووە. هەروەها ئەوە جێگەی ئاماژە پێکردنە، کە بە تەواوی نازانین لە چ دەورانێکی مێژوودا، بەشێك لە تورکەکان پەڕیوەی ئاسیای ناوەڕاست بوون، کە لانکەی هاوبەشی ئەم دوو گەلەیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە تاوەکو سنووری لیدیا* دەگرێتەوە.

---

* لیدیا Lydie : یەکێك لە شانشینە کۆنەکانی ئاسیای بچووکە و کەوتۆتە سەر زەریای ئیجە و پایتەختەکەی شاری سارد Sardes بووە. لیدیا یەکێك لە ناوچە دەوڵەمەندەکان بووە و کەوتووەتە سەر ڕێگە بازرگانییەکان. شوێنی جوگرافیایی لیدیا ئەمڕۆ بریتییە لە ئۆستانی ئەزمیر و مانیا لە تورکیا. زمانی خەڵکی لیدیا بریتی بووە لە زمانی لیدیایی، کە سەر بە گروپی زمانە هیندۆ-ئەوروپاییەکان بووە. ئەم زمانە پێوەندی لەگەڵ زمانی لووی و هیتی هەبووە و لە سەدەی یەکەمی پێش زایین لەناوچووە، (وەرگێڕ).

بوونی تورکەکان لە ئەنادۆلی ناوەڕاستی ئەمڕۆکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە هەرە دوورەکانی مێژوو و شیمانەی بنچینەی تورانیی بوونی کوردەکان دیار دەکات. لەوانەشە، هۆکاری هاوشێوە کۆچی ئەم دوو گەلە ئامۆزایەیان تاوەکو دوایین شوێنی نیشتەجێی ئێستەیان دیاری کردبێ.

لە ڕوانگەی ئانترۆپۆلۆژییەوە، سەختە جیاوازی لەنێوان تورکی پاك، ناسراو بە تورکمان و کورد بکرێ. من بەر لە دەساڵ دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵکەوت لە عێراق لەم پرسە بکۆڵمەوە. من ئەوە دووپات دەکەمەوە، کە من هیچ نیشانەیەکی جەستەییم بەدی نەکرد بۆ ئەوەی بتوانرێ لە یەکتر جیا بکرێنەوە. ئەوە گومانی تێدا نییە کەوا ژیانیی چیاییی کوردەکان وایکردووە کە سروشتیان کەمێك وشك و ڕەق بێت.

هەرچی تایبەتە بە زمانی کوردی، نازانم تا چ ڕادەیەك لەگەڵ زمانی تورکیدا هاوبەشە، بەڵام خزمایەتی لەگەڵ زمانی فارسیدا ئاشکرایە. بەهەر حاڵ ئێمە لەسەر ئەوە کۆکین کە ئەم دوانەی دوایی، بەقەد ئەوەی کە بڕێك لێکچوونیان هەیە، وێرای ئەوەش کە هەر یەکەیان زمانێکی سەربەخۆن. ئەوە گومانی تێدا نییە کەوا زمانی کوردی زمانێکی هیندۆ-ئەورووپییە. باوەڕکردوو بە نووسەرانی خاوەن متمانە لەبارەی ئەم باسەوە، لەو باوەڕەدان، کە میدییەکان، گەلی ئاری، لەکاتی حاکمیەتی خۆیان لە کوردستاندا، زمانی خۆیان هێناوە و لەگەڵ زمانی ڕەسەنی گەلی کورد تێکەڵیان کردووە. ئەوە لێرەوەیە کە خزمایەتی زمانی کوردی لەگەڵ زمانی فارسی دا سەرچاوەی گرتووە.

لەوکاتەوەی کە زانایانی کورد، تورك و فارس دەست پێشخەری ئەوەیان کردووە لێکۆڵینەوەی دروست لەسەر مێژووی خۆیان بکەن، زانا بێگانەکانیان سەراسیمە کردووە بۆ ئەوەی کەمێك زیاتر خۆیان بە لێکۆڵینەوەی ئیتنۆگرافی گەلانی ئاسیایی سەرقاڵ بکەن. لە لایەکەوە، ئەو هەڵکۆڵینانەی دەستیان دراوەتێ و ئەو پرۆژانەی لەم شوێنانە کراون بەمزوانە چاکتر ئەو خاڵانە ڕوناك دەکەنەوە کە هێشتا لە تاریکاییدا ماونەتەوە. کێ دەزانێ چ موژدەیەکی ئارکیۆلۆژی لە ئاستانەی جیهانێك کە لەژێر پێیەکانماندا شاردراونەتەوە بۆمان لە بۆسەدایە.

سەرگوزشتەی مێژووی گەلی کورد لەنێوان ڕوخانی ئیمپراتۆریای فارس ساڵی ٦٥٢ و پێوەلکانی کوردستان ساڵی ١٥١٤ بە نێوانگیری زانا ئیدریسی بدلیسی [٣٥] بە ئیمپراتۆریای عوسمانی، هاریکاریمان دەکات بۆ تێگەیشتنی ئەو تێزەی کە ئێمە لێرەدا دەیخەینە بەرچاو.

---

[٣٥] ئیدریس بدلیسی( بدلیس ١٤٥٢-١٤٥٧-ئەستەموول ١٥/١١/١٥٢٠). ئیدریس بدلیسی یان ئیدریسی بدلیسی، زانای ئایینی و پیاوی دانای بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی بە نەتەوە کوردە. لە دەوروبەری ساڵی ١٤٥٢-١٤٥٧ بەگوێرەی زۆربەی سەرچاوەکان لە بدلیس و بەگوێرەی برێك سەرچاوەی دیکەش لە دیاربەکر لە دایکبووە. ناوی تەواوی مەولانا حەکیمەددین ئیدریس حوسامەددینی عەلی بدلیسییە. مەولانا شێخ حوسامەددینی عەلی بدلیسی باوکی، پیاوێکی دانا و تەواو ناسراوی سەردەمی خۆی بووە و موریدی سەیید نوور محەمەدی دامەزرێنەری تەریقەی نوربەخشی بووە. دوای مردنی باوکی، ئیدریس لە دەرباری ئاق قۆینلۆ، لە خزمەتی یاقوبی کوڕی ئۆزۆن حەسەن کاردەکات. لەگەڵ توندبوونی ململانێی نێوان عوسمانی و سەفەوییەکان، سەرنجی سوڵتان سەلیم یاوز بۆخۆی ڕادەکێشێ و لەشەڕەکانی عوسمانی دژ بە مەملوك و سەفەوییەکان پشتگیری لە سوڵتان یاوز دەکات. ئیدریس یاریدەی سوڵتان دەدات لە سەقامگیرکردنی ئیدارەی عوسمانی لە میسر دوای داگیرکردنی ساڵی ١٥١٧. چەندین پۆست و پایەی گرینگ لە دەرباری عوسمانی وەردەگرێ و ڕۆلێکی گرینگ دەگێڕێ لەوەی ئورفە و مووسڵ بە بێ جەنگ بچنە ژێر قەلەمڕۆی عوسمانییەوە، بە هەمان شێوە ماردین دوای گەمارۆدانێکی دوورودرێژ. زۆرترین بەشی کوردستان بە بێ شەڕ و بەپێی ڕێکەوتنێك خۆیان خستە ژێر باڵی ئیمپراتۆریای عوسمانییەوە. ڕۆژی ١٥ ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٥٢٠ لە ئەستەموول کۆچی دوایی دەکات. تەرمەکەی لە مەزاری (ئیدریس کۆسکو) واتە (ماڵی ئیدریس) یان (ئیدریس چەشمەسی) واتە (کانیاوی ئیدریس) کە لە لایەن خاتوو زەینەبی هاوسەرییەوە وەکو وەقف وەرگیرابوو، نێژراوە. لە گرینگترین بەرهەمەکانی: ١-سەلیم نامە، ٢- شانامەی سەلیم ( کە بریتییە لە مێژووی داستانی دەورانی سوڵتان سەلیم یاوز)، ٣- هەشت بەهەشت و گەلێکی دیکە، (وەرگێڕ)

ئەم پیاوە زانایە زیرەکە بە ئاگابوو لە هەڵوەشاندنەوەی حکومەتە کوردییــەکان و ئــەو نــاکۆکی و دووبەرەکییــەی کــە کــەوتبووە نێــوان ســەرۆکی حکوومەتــەکان و ئــەو ڕەوشــە کارەستبارەی کە لە سۆنگەی فراوانخوازی و هەژموونی ســەفەوییەکان و دەســتێوەردانیان لــە کاروباری حکوومەتە کوردییــەکان خــراپتر شــلۆقاو و نــاجێگیر بــوو بــوو، بۆیــە دەیویســت ڕزگاریان بکات. بــۆ چارەســەرکردنی هــەموو ئەمانــە، ئــەو وای پــێ باشــبوو کــە هــەموو کوردستان بە دەوڵەتی عوسمانییەوە بلکێنێ کە بە تۆکمەیی ڕێکخراوە ناوخۆییەکانی، ســوپا هەمیشە سەرکەوتووەکەیی و لەســەرووی هــەموو ئەمانــەش بــە شارەســتانی مکومییــەوە هەموو جیهانی، بۆ خۆی سەراسیمە کردبوو.

سوڵتان سەلیم (یاوز) پێشنیازی ئیــدریس بدلیســی هاوڕێکــەی قــەبووڵ کــرد. ئــەوە بەمشێوەیە بوو کە دەورانی ئاشــتی، ئاســایش و مــەزنیی یەکیــەتی کوردەکــان و پێوەنــدی بەهێزیان لەگەڵ تورك بــەدیهات. هــەرزوو، لــەماوەی کــەمتر لــە ســەدەیەکدا، لــە ســایەی یەکیەتی سروشتیی هاوخوێنیی ئەم دوو گەلە، تــورك بــەردەوام هەڵکشــانی شــکۆمەندانەی خۆیان بەرەو ڕۆژهەڵات وەك چۆن بۆ ڕۆژئاوا دەبرد و بە حەماسەیەکی زۆر بێهاوتا یەکێك لــە ئیمپراتۆرە هەرە گرینگەکانی جیهانیــان دروســتکرد. ئیمپراتۆریــای عوســمانی لــە دەورانــی زێڕینی خۆیدا دەسەڵاتی بەسەر سێ کێشوەری کۆندا ڕادەگەیشت، لــەنێوان زەریــای خــەزەر و زەریای هیندی لە ڕۆژهەڵات، لە جەزایر و کەناری ئەتلەنتیکەوە بۆ ئەدریاتیك لــە ڕۆژئــاوا، لە باکوور زەریای ڕەش لەگەڵ هەرێمەکانی دەوروبەری تاوەکو دیوارەکانی ڤیەننا، لەکاتێکــدا لە باشوورەوە، تەواوی نیمچە دوورگەی عەرەبی و ئەفریقای باکووری بەخۆوە گرتبوو تــاوەکو بیابانی عــەرەبی. بەمشێوەیە ئەم یەکیەتییە وایکرد تامی خۆشی و شەوق و شۆڕی شــانازی لەهەموان ئەفسوناوی تر و لە هەموان ویستراوتری جیهان بکەن. دواتر، تــاڵیی ئەوەشــیان چەشــت کــە ببیــنن ئیمپراتۆریایــە شــکۆمەندەکەیان کەوتۆتــە نــاو تێکشــکان لەســۆنگەی فەرامۆشکردنی بەهرە وەرگرتنی زانستی کە ئەو دەوڵەتانەی لــە کێشــەی بــەردەوام دابــوون لەگەڵیدا بایەخیان پێدەدا.

دەتوانین بڵێین پێکەوەژیانی ژیانی سیاسیی، لە باشترین هەل و مەرجدا تا ئاگربەسی جەنگی گەورە بەردەوام بوو. ئەو کوردانەی کە لە ئێران دەژیان تاوەکو دوایین دە ساڵە ژیانی نیمچە کۆچەری و دەرەبەگایەتیان هەر پاراستبوو. ڕۆحی ژیانی گۆشەگیری، ناوچەگەرێتی باڵی بەسەر ڕەوشی ئێراندا کێشا. ئەوەی مایەوە ئەم ڕۆحیەتەی ژیانی گۆشەگیرییە، ئەم ناوچەگەرییە تەنها تایبەتیی کوردەکان نەبوو. کورد تەنها هەرێمی خۆی دەناسێ و لە دەرەوەی هەرێمی خۆی، جیهان بۆ ئەو بێگانەیە.

کورد کەڵکەڵەی پێوەندیگرتنی نییە.، ئەوانەی کە لە بەشی ناوخۆیی لە قوتابخانە بەرزەکانی تورکیا بوون ، زۆرچاك گرۆبەندی قوتابیانی هەندێك لە ویلایەتەکانیان لە بیرە. ئەو شوێنانە شوێنی بیری نەتەوایەتی (ناسیۆنالیزم) نەبوون کە کۆیدەکردنەوە، بەڵکو شوێنی لە دایك بوون یا هاوژیانیی قوتابخانەی ناوەندی بوون لە چەند هەرێمێکدا کەوا لە یەك گرووپدا کۆی دەکردنەوە. ئەلبانییەك، تورکێکی پاك بە گۆشەگیری دەژیان و پێوەندیان لەگەڵ کوردەکانی گرووپەکەیاندا هەبوو.

دەبێ لەناو ئەو ڕووداوانەی کە لە هەمووان گرینگتر لە ئێراندا بەڕێوەچوون دوای ئاگربەس، ئیشارە بە بزووتنەوەی سمکۆ(ئیسماعیل ئاغا) بکرێ. ئەم بزووتنەوەیە هیچ سروشتێکی نەتەوایەتی نەبوو و بەڵکو تەنها ئامانجی ئەوەبوو هۆزگەلی زیاتر بخاتە ژێر دەسەڵاتیی خۆیەوە. بۆیە، ئەگەر بمانەوێ مەیل و سایکۆلۆژیای گەلی کورد کورت بکەینەوە، هیچ لەوە باشتر نییە ئەوە دەربڕین کە ئەم چەند وشەیەی کە من لە کتێبی خولاسەی مێژووی کورد و کوردستانی نووسەری بەناوبانگی ئەو نەخشەیەم وەرگرتووە کە بەر لە ئێستە ناوم هێنا." کوردەکان بۆ بەرگریکردن لە هەقی خۆیان و مانەوەی ئازادی خۆیان، کوشت و کوشتاریان کردووە، خۆیان بە کوشت داوە، تالآنیان کردووە و تالآنیش کراون"[٣٦].

---

[٣٦] محەمەد ئەمین زەکی، خلاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، بەرگی یەکەم، چ دار السلام، بەغدا، ١٩٣١، لا: ١٣٨

لێرەدا ئازادی بە مانای سەربەخۆیی نایەت، بەڵکو ئەوە زیاتر بە مانـای مـل نەدانـە، کە لای کورد زۆر بڵاوە. کورد هەرگیز ڕێگە نادەن کەوا هەستی عیززەتی نەفسیان لـە لایـەن خەڵکی دیکەوە بریندار ببێ، هەتا ئەگەر ئەوە نرخەکەی ژیانی خۆشیان بـێ، کوردەکـان بـە هیچ کلۆجێ زەلیلی قەبووڵ ناکەن. کورد هیچ کات هەستی نیشتمانیی سـەربەخۆیی خۆیـان ڕانەگەیاندووە. خۆ ئەگەر برێك لە سەرۆکەکانیشـی خواسـتی ئـەوەیان هـەبووبێ دەسـەڵاتی خۆیان لەسەر هـەرێمێکی بـەرفراوانتر درێژبکەنـەوە، ئـەوا هـەرگیز ئـەوەیان لـە سـۆنگەی هەستێکی نەتەوایەتییان نەبووە.

بۆ نموونە، سوڵتان سەلاحەددین، بە بەهرە و ئاکاری بـەرز و جەسـووری خۆیـەوە، کـە هەموو موسڵمانان بە گشتی و تۆرانییەکان بە تایبەتی شانازی پێوەدەکەن، ئیمپراتۆریایـەکی بەهێزی دروستکرد، بەڵام هەرگیز خەونی ئەوەی نەبوو کە بیکاتـە ئیمپراتۆریایـەکی کـوردی هەر وەك چۆن بە هەمان شێوە بەم دواییانە، سەدەیەك بەر لە ئێستە، ئەوکاتـەی کـە کـەریم خانی زەند بوو بە (شا) ی بەهێزی ئێران، بیری لەوە نەکردەوە، کە شانشـینێکی کـوردیی لـە ئێراندا دروستبکات.

بەڵام کورد بەشـداریان لەگـەڵ گـەلانی دیکـەدا کـردووە و بـەڕێوەبردنیان لـە لایـەن ئەوانەوە هەمیشە شتێکی نایاب بووە. ئەمەیان مۆنتالیتەی کوردە لە وەتای چـل و هەشـت سەدەدا. پێ لەسەر مێژووی کورد داناگرم کە وەچـەی ئێمـە شـایەدحاڵیەتی، بـەڵکو چـەند نوختەخاڵێك دیاری دەکەم کە من بە کەسیی خۆم لە نزیکەوە تێیدا بەشداربووم.

٣٧ ساڵ بەر لە ئێستە ئەوکاتەی، کە مـن بـە لای سیاسـەتی گشـتیدا شـکامەوە و هۆشیاری نەتەوەییم تێدا ڕوابوو. دوای مەشرووتەی عوسمانی لـە سـاڵی ١٩٠٨، لـە کـاتی دامەزراندنی جەمعیەتی تەعاون و تەرەققیی کـورد[٣٧] مـن بـە پەلـەتاو بـەدوای یەکـەمین

---

[٣٧] جەمعیەتی تەعاون و تەرەققیی کورد بە شێوەیەکی ڕەسمیی ڕۆژی ٢ ی تشرینی یەکـەمی ١٩٠٨ لە ئەستەمووڵ لەلایەن کۆمەڵێك تێکۆشەری کـورد وەك ئـەمین عـالی بـەدرخان، شـەریف پاشـای خەندان، داماد زوکفل پاشا، سەیید عەبدولقادر شـەمزینانی و کۆمـەڵێك نیشـتمانپەروەری دیکـە

بانگەوازی کۆبوونەوەی بڕێك لە بەگزادە کوردەکانم چووم. من یەکێك لە چاکترین وتارخوێنەکانی ئەو کۆبوونەوانە بووم. لە کاتی هەڵبژاردنی بیرۆی بەڕێوەبەرایەتی، دوای نەعیم بەگی بابان، من زۆرترین دەنگم بەدەستهێنا، لە کاتێکدا کەوا من نە بەگزادە بووم و نە لە بنەماڵەیەکی گەورەش بووم. بەڵکو سۆزی گەرمایی ڕۆحم، دڵی ئەوانەی گەرم دەکردەوە کە هەر نەشیاندەناسیم. پاشان دوای ئەوەی کە بڕوا-متمانە-ی هەمووانم وەرگرت هیچ کەس، هیچی لای من نەدەشاردەوە. من ئەوە دووپات دەکەمەوە کە هیچ یەکێکیان لەوانە بیری لە کەمترین ئیمتیاز نەدەکردەوە بۆ کورد. بەڵام هەموو بە تێکڕایی لەسەر ئەوە یەکڕا بووین کەوا دەبێ ڕیفۆرمێك لە شەش ویلایەتە ڕۆژهەڵاتیەکاندا بکرێ. ئەوەیان ئەو ڕیفۆمە بوو کە داوا دەکرا: ناونانی حاکمانی بە توانا و شەرافەتمەند، ڕاکێشانی چەند ڕێگەوبانی سەرەکی و چاکسازیکردنی دادگەکان بۆ ئەوەی دادپەروەیێکی چاکی تێدا پیادە بکرێ.

لەو باوەڕەدانیم کەوا ئەندامانی کۆمەڵەی قوتابیانی کورد (هێڤی)[38] کە لە پێش جەنگی بالقان دامەزرا بە تەواوی بیریان لە جیاکردنەوەی کوردستان کردبێتەوە[39]. چونکە

---

دامەزراوە و سەیید عەبدولقادر شەمزینانی بووە بە سەرۆکی ئەم جەمعیەتە. ئەم کۆمەڵەیە وێرای ئەوەی، کە لە مێژووی کورتی خۆیدا توانی چەند یانەیەکی کوردی کولتووری و هۆشیاری لە زۆربەی شارە کوردییەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانی بکاتەوە کەچی هەر زوو لەگەڵ ڕەوتی پان-ناسیۆنالیستی تورکخوازانەی ئیتتیحادییەکان پێکدا هەڵپژران و دواجار نەیتوانی لەڕووی سیاسییەوە جگە لە سەرەتایەکی کورت بۆ ژیانی ڕێکخراوەیی چیتر لە دوای خۆیەوە بەجێبهێڵێ. لە دوا دواییەکەی ساڵی ۱۹۰۹ بە یەکجاری کۆتایی بە ژیانی ئەم ڕێکخراوە هات، (وەرگێر).

[38] دوای ئەوەی لە تەمووزی ۱۹۱۲ پارتی حورییەت و ئیئتلاف لە تورکیا دەسەڵاتی سیاسییان گرتە دەست، هەوڵێکی زۆریدا بۆ ڕاکێشانی پاڵپشتیی کورد و لەگەڵ ئەم ڕەوشە نوێیەدا لە ۲۷ی تەمووزی ۱۳۲۸ی ڕۆمی (۱۹۱۲/۸/۹ی زایینی) جڤاتا هێڤیی قوتابیانی کورد لە لەلایەن هەندێك گەنجی کوردەوە، کە سەرقاڵی خوێندنی باڵا بوون، لە ئەستەنبوڵ دامەزرا.

سەرەتا لە گەڕەکی سیرکەجی لە بەرامبەر پۆستەخانەی نوێ و لە شوقەی ئەرزڕۆمدا شوێنێکیان بەکرێ گرت و ناوەندی جڤاتەکەیان بردە ئەوێ و لە ڕۆژنامەکانیشدا ئادەرسەکەیان بڵاوکردەوە، دواتر بەهۆی تەنگ بوونی شوێنەکەوە بارەگای ناوەندی جڤات دەگوێزنەوە بۆ بەرامبەر هوتێل مەسەرڕەت، لەوێ لەقاتی سەرەوەی (ئیدارەخانەی ڕەسملی کیتاب)دا شوێنێك بۆ ناوەندی جڤاتەکە بەکرێ دەگرن بەڵام دواجار بارەگاکەیان دەبەنە جادەی فەوزیە لە گەڕەکی شازادە باشی. ئەم کۆمەڵەیە ڕێکخراوێکی ئەدەبی قوتابیان بوو و زیاتر بایـــەخی بە زمان و ئەدەبیی کوردی دەدا. ئەم ڕێـــکخراوە لە لایەن عەبدولڕەحـــمان بەدرخان، فوئادی تەمۆ و ئەحمەد ڕامز زادە بەگ و ئەکرەم جەمیل پاشا دامەزراوە. بە گوێرەی ئەکرەمی جەمیل پاشا لەو سەروبەندە زیاتر لە دووسەد قوتابی کورد لە ئەستەمووڵ هەبووە. کۆمەڵە جگە لەناو شارە گەورەکانی وڵات لە دەرەوەش لقی هەبووە لەوانە: جنێف، لۆزان و میونیخ. کۆمەڵە چوار ژمارەی لە گۆواری "ڕۆژی کورد" بڵاو کردۆتەوە و لەگەڵ دەستپێکی یەکەم جەنگی جیهانیی چالاکی وەستاوە و دوای جەنگ ساڵی ١٩١٩ دەستیان بە چالاکی ڕوناکبیریی کردۆتەوە و تا ساڵی ١٩٢٢ بەردەوام بووە. بۆ زانیاریی زێدەتر و لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەبارەی ئەم کۆمەڵەیە بگەڕێوە بۆ: مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢ (یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)*، لەتورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەڵاتی، پێشەکیو پێداچوونەوەی عەبدوڵڵا زەنگەنە،٢٠٠٧.، ڕۆهات ئالاکۆم، کوردەکانی ئەستەمبوولی کۆن، وەرگێڕانی: ئەحمەد تاقانە، دەزگای موکریانی، ٢٠٠٥، و عەبدوڵڵا زەنگەنە، ڕۆژی کورد گۆڤاری جڤاتی " هێڤی"ی قوتابیانی کورد ١٩١٣- ئەستەمووڵ، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥، (وەرگێڕ).

[٣٩] زنارسلۆپی، کە ئەندامی دەستەی دامەزراندنی هێڤی بووە، ئەم بۆچوونانە بە تەواوی ڕەت دەکاتەوە و ئاماژە بەوە دەکات کە ((شوکری محەمەد بەگ یارمەتی مادی و مەعنەوی کۆمەڵەی هێڤی داوە و بۆچوونی نەتەوەیی لەنێو گەنجەکاندا بڵاو کردۆتەوە، بەڵام دواتر داوای پەنابەری لە بەغدا دەکات و لەپاش ئەوەی کە بڕیاری لێبوردنی بۆ دەردەچێ، تەنیا بۆ ڕازیکردنی دڵی تورکان خراپەی کوردەکانی ویستووە و لە نامیلکەیەکدا بوختانی بۆ کۆمەڵەی هێڤی هەڵبەستووە، ئەندامانی ئەو ڕێکخراوەی بەوە تۆمەتبار کردووە کە بۆچوونێکی دیاریکراویان نەبووە کە ئەمەش

من بەتەواوی باوەڕی ئەوانم بەدەستهێنابوو کە هیچ یەکێکیان ئاماژەیەکی وای بۆ نەکردم. ئەمە واتای ئەوە نییە کەوا هیچ کوردێك نەبووە بیر لە دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی بکاتەوە. هەتا ئەگەر هەش بووبن، دانیان پیادا نەدەنا یان زۆر بە ڕاشکاوی بیرکردنەوەی دڵی خۆیان ڕانەدەگەیاند. بەشێکی ئەم ناسیۆنالیستە کوردانە کەوا باوەڕێکی تەواویان بە پێویستی بوونی دەوڵەتێکی کوردی هەبوو لە ماوەی خەباتکردنیان بۆ ئەم ئامانجە لەناوچوون.

ڕێزگرتوو وەکو پرەنسیپ لە باوەڕی سیاسیی هەرکەسێك، من ڕێگە بە خۆم نادەم لێرەدا گفتوگۆی ئەوە بکەم داخۆ ئەم باوەڕە وەڵامدەرەوەی حەقیقی گەلی کورد بووە. هەڵبەت بە ڕێزگرتن لەبەرامبەر گیانی پاك و بێگەردی ئەو کوردانەی کە قوربانی نیازپاکیی خۆیان بوون لە ماوەی خەباتکردنیاندا بۆ ئازادی نیشتمانەکەیان سەر دادەنوێنم.

هەرچی لەبارەی چالاکی ڕێکخراوە سیاسییەکانە لە ماوەی ئاگربەسیی جەنگی جیهانی، هیچ سیاسەتوانێکی کورد بە ڕاستی قەناعەتی ئەوەی نەبوو کە پێویستە کوردستان لە تورکیا جیابکرێتەوە. من بۆ خۆم کە وەك ناسیۆنالیستێکی کورد ناوم دەبەن، بە هیچ شێوەیەك لە هەموو ژیانمدا بیرم لە جیاکردنەوەی کوردستان لە تورکیا نەکردۆتەوە. ئەوە لەبەر ئەوە نەبووە کە من خوازیاری سەربەخۆیی کوردستان نەبووم، بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو کە، ئارەزووێکی ئاوەها داوایەکی مەحاڵ یا بێهوودە بوو. من تەواو قەناعەتم لە لا دروست بوو کە جیاکردنەوەی کوردستان لە تورکیا نە لە ڕووی مادی و نە لە ڕووی مەعنەوییەوە ژیاو نییە. هەموو ئەوانەی کە لەگەڵ مندا کاریان کردووە لە ویژدانی خۆیاندا هەمان باوەڕیان هەبوو.

---

ڕاست نییە))، بڕوانە: مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان* ١٩١٢-١٩٢٢ *(یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)...هەمان سەرچاوە*، لا:٨٥

پێویستە بە بێلایەنانە لە مێژووی کورد بکۆڵرێتەوە و شیبکرێتەوە، لێکۆڵینەوەیەکی ورد بۆ تێگەیشتن لە نهێنییەکانی پەرەئەستاندنی، پاشان بۆ دەرئەنجامکردنی چەند ڕاستییێکی واقیعی، ئەمە بۆ ئەوەیە بەرنامەیەکی کارکردن بۆ کوردەکان دابنرێ. دارشتنی پلانێکی چالاکینامەی سیاسیی دژ بە ئامادەگیی میراتی، دژ بە هەڵکەوتوویی و ڕۆحیی گەلی کورد کە مەحکومە بە شکستی زۆر کارەستبار. ئەم ڕاستییە نابێ بە هیچ شێوەیەك لای ئەوانەی کەوا سەرکردایەتی چارەنووسی ئەم گەلەی ئێمەیان لە بن دەستە شاردراوە بێ. من بەڵگەم لە بن دەستە، کە هەتا لە تەنگەتاوترین کاتی تورکیاشدا، هیچ یەکێکیان لە ڕاستیدا مەیلی جوداخوازیان نەبووە[٤٠].

---

[٤٠] د.شوکری سەگبان لەمڕووەوە زۆر ڕاست دەکات تا ئێستا هیچ بەڵگەنامە و دەستاوێژێکی مێژوویمان لەبندەستدا نییە، کە پێچەوانەی بیروڕاکەی سەگبان بسەلمێنێ، بۆ نموونە لە هەتاوی کورددا باسی ((ئارەزوی پاك و نیازپاکانەی لاوانی کورد سەبارەت بە کوردایەتی لەژێر دەسەلاتی خیلافەت و سەلتەنەتدا دەکرێ)) و بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەش کە هەندێك لە ئەندامانی هێڤی ((پێیان وابووە کە پێویستە کۆمەڵەکە، بەر لە هەموو شتێك، پەیوەندی و وابەستەییەکانی خۆی لەگەڵ مەقامی خیلافەتدا بەهێز بکات)). لوتفی فیکری، کە لە یەکەمین مەجلیسی مەبعوساندا نوێنەری دێرسیم بووە، لە بابەتێکدا کە لە گۆڤاری (ڕۆژی کورد) ژمارە (٤)دا زۆر بە ڕاشکاوانە باسی ئەوەی کردووە کە نەتەوەی کورد ئەگەر خوازیاری ئەوە بێت کە لە دەوڵەتی عوسمانی جیا بێتەوە (عاقیبەتی خێر و پایەدار نابێ): ((*ئەتەوەی کورد لەو ساتەوەی کە لە دەوڵەتی عوسمانی جیا بێتەوە یان وەکو کاتێ لەگەڵ نەتەوەکانی دراوسێیدا بەتایبەتی ئەرمەنەکاندا دەست بەشەڕو ئاژاوە بکات تووشی زەرەرو زیانێکی گەورە دەبێت. یانی شانسی سەرکەوتن و هەڵکردنی کورد بەشێوەی سەربەخۆ لەم سەدەیەدا زۆر کەمە. لەوانەیە جیابوونەوە ببێتە هۆی ئەوەی کە کورد هەمیشە لە شەڕو ئاژاوەدا بژی. لەڕاستیدا ئەوانەی کە دەیانەوێ نەتەوەی کورد دروست ببێت قەت بیر لەوە ناکەنەوە کە کوردستان لە ئەنادۆڵ جیا بێتەوە هۆیەکی تر بۆ جیابوونەوەی پێکهاتەکانی ئەنادۆڵ لەیەکتری زیاد بکەن. ئەوانە بە هەموو توانای خۆیانەوە خزمەتی کورد و کوردایەتی دەکەن و کوردایەتی ناکەنە بیانوویەك بۆ جیابوونەوە و پارچە پارچە بوون بەڵکو بە پێچەوانەوە کوردایەتی*

بەڵام ڕەوشی سیاسیی لەو سەردەمەدا پێویستی بەوە دەکرد کە وەکو جوداوازخواز ڕەوتار بکەیت. وا دیاربوو کەوا نوماینده‌کانی هێزە هاوپەیمانەکان لە ئەستەنبووڵ ئاگایان لە قولایی بیرکردنەوەی ئێمە هەبووبێ. چونکە وێڕای داخوازینامەکانی مافە هەمیشەییەکانی گەلی کورد و تاوانباریکردنی ئێمە، کەچی ئەوان بە بەردەوام هەر سڵیان لە ئێمە دەکردەوە. ئەوان پێیان وابوو کە هەر کات هەژموونی ئەوان نەما، کوردەکان بەگەڵ تورکەکان دەکەونەوە. ڕاستییەکەی هەتا ئەمڕۆش هەست بە شوێنکارەکانی ئەم دوژدۆنگییە دەکرێ لە ئاڕاستەی سیاسیی بڕێك لە هێزە گەورەکان لەم بەشەی جیهاندا.

ڕووداوەکانی دواتر ئەوەیان بەدیارخست کەوا دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دەبێتە کارەساتێك، بەلایەك بۆ سەر قازانجی ڕاستەقینەی بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد. من بۆ خۆم لەوە بەدوور دەگرم لێرەدا لێکدانەوەی پێویست بەدەستەوە بدەم، کە حوکمدانێکی ئاوەها پێویستیەتی وێڕای هەڵوێستی ڕاشکاوانەم کە پێی ڕاهاتووم و گرتوومەبەر، کەچی ئەوە بەسەرخۆم دا فەرز دەکەم لەمبارەیەوە شاراوە بم بۆ ئەوەی هەموو چەشنە بەدحاڵیبوونێك بەدوور بگیرێ.

لەسەرێکی دیکەوە، ئاوەڕۆی ڕەوتی ئابووری و سیاسیی تەواوی جیهان بەرەو یەکگرتوویی (کۆنفیدراسیۆن) دەڕوات نەوەکا جیابوونەوە.

---

دەکەنە هۆیەك بۆ پتەوکردنی یەکێتی و یەك ڕیزی و ئاوەدانی و بەختیاری خەڵکی عوسمانی)).
لەوەش زیاتر لە سەرەتاکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا ژمارەیەك لە ئەندامانی کۆمەڵەی هێڤی لە دەرەوەی وڵات، بە مەبەستی بەشداری کردن لە سوپای عوسمانیدا گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی عوسمانی و ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئەوانە نەیانویستووە لە دەوڵەتی عوسمانی جیاببنەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢ (یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)....هەمان سەرچاوە*، لا:٨٧-٨٨


نەجمەدین حوسێن کەرکوکی

پڕۆژەی پان-ئەوروپا، کۆنفیدراسیۆنی دەوڵەتانی کێشوەر-ی بەڕێز ئا، بریاند[41] سەردەکەوت ئەگەر دوو شارەستانی ناکۆك، شارەستانی سەرمایەداری و ئەوەی کۆمۆنیزم لە سەرکەوتنی کۆتاییدا کێبەرکێ یان نەکردبوایە. ڕاستییەکەی، ئەو دەوڵەتانەی کە لە دوای لێکهەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریایەکی دیکە لە دایك بوون ناچاربوون هاوپشتییێکی بچکۆڵە دروست بکەن بۆ جێگرتنەوەی کۆنە ئیمپراتۆریای هابسبۆرگ بە ئامانجی پاراستنی بەرژەوەندییە سیاسیی و ئابوورییەکانیان.

ئەی کەوایە کێن ئەو خەڵکانەی کە کاروباری خۆیان واز لێدەهێنن بۆ سیاسەتی کوردی؟ هۆیەکەی ئەمە چیە؟

من لە نامەیەکی کراوە کە ساڵی ١٩٢٣ لە قاهیرەدا بڵاومکردەوە ئەو هۆیانەی چالاکی سیاسیی کوردەکانم خستبووە بەرچاو کە نامەوێ هیچی تر بگەڕێمەوە سەریان.

بەڵکو دەمەوێ لێرەدا ئەو گفتوگۆیە وەبیربهێنمەوە کە لەنێوان بەڕێز نەجمەددین حوسێن[42] ، وەفدی جەمعیەتی تەعالیی کوردستان لە لای کۆمەڵەی بەرگری لە شەش

---

[41] Aristide Briand (٢٩ی ئاداری ١٨٦٢-٧ ی ئاداری ١٩٣٢). پیاوی سیاسیی فرەنسییە و چەندین جار و لە چەندین حکوومەتی جیاجیای فرەنسی وەزیری کاروباری هەندەرانی فرانسا بووە . لە ٥ ی ئەیلوولی ١٩٢٩ لە بەردەم دانیشتنی دەیەمی ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان کە لە ژنێڤ کۆبوونەوە لە ئاخاوتنێکی بەناوبانگدا داوای پرۆژەی (پێوەندی فیدرالی) کرد لەنێوان دەوڵەتە ئەورپییەکان و پرۆژەی پان-ئەوروپانیزمی خستە ڕوو، (وەرگێر).

[42] نەجمەددین حوسێن کەرکووکی (١٨٨٦- ؟) برا گەورەی ئەسیری شاعیر بووە، یەکێك لە ڕۆژنامەنووس و سیاسەتوانە دیارەکانی دوای مەشرووتەی ساڵی ١٩٠٨ ەو لە گۆواری (ڕۆژی کورد) و (هەتاوی کورد) و (ژین) گەلێك بابەتی نووسیوە. یەکێك لە دامەزرێنەرە کارایەکانی جەمعیەتی

ویلایەتەکە و بەڕێز شەمسەددین، ئەندام پەرلەمانی ئەرتەغۆل، کە لـە یەکـەم دانیشـتنی دا بەسەرۆکایەتی ئەلیاس سامی ئیف، ئەندام پەرلەمانی مـووش پێکهـات. منـیش هـەروەها داوەتی ئەم کۆبوونەوە کرابووم. سەرۆك داوای لە نەجمەدین کرد داخۆ بەرنامەی کۆمەڵەکەیان چییە. ئەمیان دەستی کرد بـەوەی ئارمـانجی چـالاکییەکانی بلێتـەوە، ئەگـەر ڕێگـەم بـدەن پێبدەن بەمشێوەیە بلێم بۆ تۆرانییە کورد زمانەکان، بە هیچ شێوەیەك شـتێکی وا تایبـەتیی تێدا نەبوو جگە لە بەکارهێنانی زمانی کوردی لە خوێندنی قوتابخانەکان لە کوردستاندا. ئـەو بابەتانەی دیکە کە ئیشارەی پێدان تۆرانییە تـورك زمانەکانیشـی دەگرتـەوە. شەمسـەددین بەگ دەمووەدەست بە توندی وەڵامی دایەوە، بـا ئێسـتە مەسـەلەکەمان بکەینـە یـەك بـۆ ڕزگارکردنی سـەرتاپای وڵات لـەو مەترسـییەی پێـدا تێپـەر دەبێـت، دواتـر ئێمـە دان بـە بەکارهێنانی زمانەکەتان دادەنێین. بەڕێز نەجمەددین دەربڕی زمانحاڵی خواسـتە هاوبەشـەکانی هەموو کورد بوو. وەکی دیکە، منیش ئەوکاتەی خواستەکانی خۆمانم لەو نامەیەدا دەربـڕی کە تازە ئاماژەم پێدا (لە لاپەڕە ٢٢) پێم لەسـەر دانپیانـانی زمـانی کـوردی لـە خوێندنـدا داگرتبوو، کە ئەمە تاوەکو بەر لەم چەند ساڵەی دوایی ئیدیالێك بوو بۆ هەموومان.

ئایـا ئـەوە نیـاز و مەبەسـت بـوو؟ مـن بـاوەڕ ناکـەم. بلێـی ئـەوە لـە ئـەنجامی بیرکردنەوەیەکی دوورودرێژ و قووڵ سەرچاوەی گرتبێ، ئەمەشیان بـاوەڕ ناکـەم. چـەندانێکی وەك من، لەو باوەڕەدابوون کە ئێمە ناتوانین ئاستی شارەستانیی کورد بەرزبکەینـەوە بـە بـێ

---

تەعالیی کوردستان ( ١٩١٨) و پارتی دیموکراتی کـورد (١٩١٩) و کۆمەڵـەی ئیجتیمـاعی کـورد (نیسان-ئایاری ١٩٢٠) بووە. یەکێك لە ئەندامەکانی کۆمەڵەی پاراستنی شەش ویلایەتەکە بوو. لە ٢٨ ی ئەیلوولی ١٩٢٢ لە دەستی کەمالیستەکان ئـاوارەی بولگارسـتان دەبێـت و تـاوەکو سـاڵی ١٩٢٨ هەر لە بولگاریا دەمێنێتەوە و دواتر لە جەنگی دووەمی جیهانیی ئیدی سۆراخی بـڕاوە کـە بە هەموو پێوانەیەك وا پێدەچێ لە ساڵانی جەنگدا فەوتابێ، بڕوانە: عەبدوڵڵا زەنگەنە، *ڕۆژی کورد گۆڤاری جڤاتی " هیڤیی" قوتابیانی کورد ١٩١٣* - ئەستەموول، بنکـەی ژیـن، سـلێمانی، ٢٠٠٥، ل:٩٥-٩٦.

بەکارهێنانی زمانەکەیان لەناو پەروەردە و فێرکردندا. هەندێکی دیکە لەو باوەڕەدان کە وەختایەك زمانی خۆیان بەکارنەهێنن، ئەوا زۆر بە ئاسانی دەتوێننەوە.

دواتر پاشان، با بە ڕاشکاوی بدوێین، بۆچی ئەمە مەترسی تواندنەوەیە؟ چ گەلێك بە کۆمەڵ یان بەشێکی لە ڕەوتی مێژوودا تواونەتەوە؟ گەلانێك هەن هیچ شوێنەوارێکی خۆیان بەجێنەهێشتووە. زۆربەی ئەڵمانەکانی سەر زەوییەکانی دەوروبەری ڕێن* (ڕێنانەکان Rhénans بریتیین لە سێلتی** بە ئەڵمانی کراو. ئەوانە بنچینەی خۆیان ناناسنەوە. ئایا ئەمڕۆ ڕەوشیان چاکتر دەبوو ئەگەر هەر وەکوو سێلت بمابوونایەوە؟

لە لایەکی دیکەوە، گەلێکی بەهێز دەزانێ چۆن گەلێکی لاواز بتوێنێتەوە بە بەکارهێنانی وەسیلەگەلی نەرم و نیان، هاوسۆزی لەگەڵیان و لە خۆیان جیاناکەتەوە. لەم ڕەوشانەدا بەرژەوەندیی کەسەکان و بەهەمان شێوە بەرژەوەندییەکانی کۆمیونیتە زۆر باشتر پارێزراو دەبن. ڕەوشی لاوازەکان کە لە لایەن بەهێزترەوە هەڵدەلوشرێ لەهەموو دەورانێکدا چاك بووە. تەنها ئەوەندە هەیە کە زەبرزەنگ بەکارنەهێنرێ.

---

* Rhin بریتییە لە گەورەترین ڕووباری کێشوەری ئەورووپا و بەناو خاکی: ئەڵمانیا، فرانسا، سویسرە، لینشستاین و هۆلەندا دەڕوات و درێژییەکەی (١٢٣٣کم)ە و لە وشەی سیلتی Renos (ڕووبار) ەوە هاتووە کە واتەی (ڕۆیشتوو، هەڵقولاو) دەگەیەنێ. ئەم ڕووبارە بۆ ئەڵمانیا گرینگیەکی تایبەتی هەیە و ماوەی چوار سەدە سنووری سروشتی نێوان دەوڵەتی ڕۆمان و هۆزە گێرمانۆفۆنەکان بوو و لە بەشی ڕۆژئاواییەوە چەندین شاری ئەڵمانی و هەروەها چەندین شاری فرەنسی کەوتوونەتە سەر کەناری ڕێنەوە، وەرگێڕ.

** سێلتەکان : Celtes (کلت یان سێلتا بە لاتینی Celtae) بریتییە لە شارەستانیەتێکی دەورانی پێش مێژووی گەلانی هیندۆ-ئەورووپایی. گروپێکی هۆزە چادرنشینە جەنگاوەرەکانی هیندۆ ئەورووپایی بوون و بە درێژایی سەدەکانی ٧٠٠ ی پێش زایین تاوەکو درێژەی سەدەی چوارەمی پێش زایین نفوزێکی زۆر و بەهێزیان هەبوو و هەر لە بریتانیاوە تاوەکو ئاسیای بچووك یان لەژێر دەستدا بوو، وەرگێڕ.

زیاد لەوە، دەوران بەردەوام بە چەندین شێوەی جیاواز گەلان هەڵدەلوشێ، ئەوە دیاردەگەلێکی کۆمەڵایەتییە کە بێ وەستان بەردەوام دەبێ. بەڵام ئەمە حاڵەتی کوردەکانی تورکیا نییە. ئامانج لەوێدا تواندنەوەی کوردەکان نییە، بەڵکو تەنها یەکخستنی دوو گەلی هاورەگەزە.

وا باوەڕدەکرێ کەوا زمان بە تەنها بەس بێ بۆ دروستکردنی نەتەوەیەك (*Das eigenständige Volk*)[43]. ئەوەمان لە بیرکردووە کە وەك ماکس هێلدەبێرت بۆیم[*] لێکی دەداتەوە بۆ دروستکردنی یەکەیەکی نەتەوەیی، ئەوەی پێویستە ئەویە، کە ئەم یەکەیە لەسەر زمان، ڕەگەز، خاکی سروشتی ( Landschaft ) ، ترادسیۆن، چارەنووس

---

[43] BOEHM, Max Hildebert, *Das eigenständige Volk. Volkstheoretische Grundlagen der Ethnopolitik und Geisteswissenschaften*, Göttingen: Vandenhoeck & Ruprecht, 1932

[*] Max Hildebert Boehm ( ١٦ ی ئاداری ١٨٩١-٩ ی نۆڤەمبەری ١٩٦٨). پیاوی سیاسیی ئاڵمان، ناسیۆنالیست، سۆسیۆلۆگ و ڕۆژنامەنووس بوو. لە ساڵی ١٩٢٠ ڕۆژنامەی *Die Grenzboten* بڵاودەکاتەوە. لە ١٩٣٣ تاوەکو ١٩٤٥ مامۆستای زانکۆ بووە لە زانکۆی فریدریك شیللەر و وانەی تیۆریای گەل و سۆسیۆلۆژیای گەلیی وتووەتەوە. لەنێوان هەردوو جەنگدا کۆمەڵێك ڕێکخراو و کلوبی دروست کردووە و لەسەر ئاستی نێونەتەوەیی لەسەر پرسگەلی "کەمینەنەتەوە" و "گروپگەلی ئیتنیکی" کاری کردووە. بۆیم کاری زۆری لەسەر چەمکی شۆڕشی کۆنسێرڤاتۆر کردووە و ئەو هەمیشە لای وا بوو کە (گەل) لە یەك کات هەم (ئێمە) و هەم (من) یشە و تاقە هێزی بزوێنەری مێژووە. دوای ساڵی ١٩٤٥ لە بەرلین لەناوچەی داگیرکردنی سۆڤیەتییەوە گواستییەوە بۆ ناوچەی داگیرکردنی بریتانییەوە. نووسەری کۆمەڵێك بەرهەمی فیکری گرینگە لە گرینگترینیان کتێبی : ( گەلی سەربەخۆ: بنەوانیی میللی و تیۆری ئیتنۆپۆلیتیك و زانستە سیاسییەکان)ە **(***Das eigenständige Volk : Volkstheoretische Grundlagen der Ethnopolitik und Geisteswissenschaften***)** کە ساڵی ١٩٣٢ بڵاوکرایەوە و سەگبان لە نووسینی ئەم کتێبەیدا وەك سەرچاوە بەکاری هێناوە، وەرگێڕ

و دەوروبەر، خێزان (هۆز-Sippe) و مەزهەب دابمەزرێ. ئـەوە هارمۆنیـا و هاوسـەنگی هەژموونی یەکگرتووی ئەم هەموو توخمە جیاوازانەیە لەسەر یەکتر، کە نەتەوەیەکی لێوە لـە دایك دەبێ. بەڕێز م. هـ. بۆهیم بەڕێوەبەری *Deutschtum*، ئەوە زیاد دەکات کەوا زمان لە ڕیزی یەکەم و دواییـدا دێـت. زمـان دەبێتـە هـۆی شـیمانەگەلی زۆر و بـەرەو ڕووی زۆر مەترسی دەبێتەوە (*بەمجۆرە لەوانەیە زمان یەکەم یان دواین بێت، بەڵام مەترسی گەورەش لـە توانا گەورەکاندایە)*[44].

بەر لە ئێستە گوتم کەوا خوێندن بە زمانی کوردی تا بەر لـەم چـەند سـاڵانەی دوایـی جۆرە ئیدیالێك بوو بۆخۆی. لەوەتای ئاگربەسی سـلێمانی لـە عێـراق و لـەوەتای زیـاتر لـە هەشت ساڵە لە هەموو هەرێمەکاندا زمانی کوردی لەو دەروناوچانەدا، زمانی خوێنـدن هـەر بە کوردییە. کەچی ئەنجامەکانی فێربوون بەم هۆیەی خوێندن بە هیچ شێوەیەك شتێکی وانین.

با گریمانەی ئەوە بکەین کەوا مامۆستایەکانی قوتابخانەکان وەك پێویست وان، کتـێبی قوتابخانەکانیش هیچ خەوشێکیان نییە و حکوومەت بە زیادەوە پارێزگـاری لـە قوتابخانـەکان دەکات و دەستەی مامۆستایان لە ڕادەبەردەر پەرۆشن و هەموو ئەمانە بێ خەوشـن.، بـەڵام ئەم دەرچووانەی قوتابخانەکان کاتێك خوێندنی قوتابخانـە تـەواو دەکـەن چـی دەخوێننـەوە؟. هیچ. تا ئەمڕۆ، بەدەر لە کتێبی قوتابخانەکان، بە ئاستەم هەر دە دوانزە نامیلکـە و کتێبێـك بە کوردی چاپکراون. دەبێ دان بەوەدا بنرێ کە ئەمە هیچ بەرژەوەنـدییەکی پراکتیکـی تێـدا نییە. هیچ هیوای ئەوەش نییە کە دواتر شت گەلێك بەو دەرچووە قوربەسەرانەی قوتابخانـەی سەرەتایی بگات بۆ خوێندنەوە، کەوایە هیچ بەرەو پێشوەچوونێك لە کولتوور بەدی ناکرێ.

کەوابوو چۆن گەلی کورد (وەك گەلێکی زۆر دواکەوتوو لە بواری شارەستانی) دەتـوانێ ئەوە قەرەبوو بکاتەوە کە لە دەستی داوە بە بێ پەروەردەکردنی منداڵەکانی بە زمانێك و بـە کتێبخانەیەك کە هەتاوەکو بـۆ پێویسـتییە هەرەگرینگـەکانی سـەردەمیش دەسـت نـادەن.

---

[44] *So mag die Sprache zwar das ersteund lezte sein-in ihren ungeheuren Moeglichkeiten liegen aber auch ungeheuren Gefahren*

لێرەوە تا سەدەیەك زمانی كوردی ئەگەر لە باشترین ڕەوشـی جیهانیشـدا پـەروەردە بكـرێ، بەوە ڕاناگات بگاتە ئاستی دەوڵەتگەلی كولتووری*.

لە برێك لە وڵاتاندا هەتا بیر لەوە دەكرێتەوە كە خوێندن لـە قوتابخانـە تایبەتییەكانـدا بە زمانێكی زۆر زیندوو بێ بۆ ئەوەی بە بەردەوامی كێڵگەی ڕۆحیـی پسـپۆڕیی پـێ زاخـاو بدەن. لەو دەمانەی كە گەلان بۆشاییەكانی ئاسمان تەی دەكەن و بـەری سـەركەوتن و شـادی دەچننەوە وەك ماریشال بالبۆ، بە خـۆیی و بەگەشـتە زەریاوانییەكـەی بـەناو ئۆقیانووسـدا، ئێمە خۆمـان وا نیشـان دەدەیـن بـەوەی خۆمـان بـە ڕەگەكانمانـەوە دەبەسـتینەوە و لـەناو تاریكاییدا دەژین.

گەلی كورد  واپێدەچێ ئەوەی لەلا باشتر بێ كە لەلایەن نەوەیەكی كۆنپارێز حووكمڕانی بكرێت كە هیچیان وەك میراتی چـاك بـۆ بـەجێ نەهێشـتووە. بـە پێچـەوانەوە، بێگومـان دادپەروەرانەتر دەبێ كاتێك لە لایەن نەوەكانی دواڕۆژەوە حووكمڕانی بكرێن.

درەختێكی قـەدبڕاو كـەمێك لەسـەرووی زەوی و بـەردەوام بـە بـڕاوی بـژی لەگـەڵ سەوزبوونی چڵی چكۆڵەی سەرما بردوو لەلا تەنیشـتەكانییەوە هـیچ نرخێكـی نییـە، هـەر شایەنی ئەوەیە لە ڕەگەوە هەڵبكێشرێ و دەربكێشرێ[٤٥]. لە كاتێكدا، قەدی درەختێكـی زاڵ

---

* Kulturstaaten

[٤٥] ئەم هەڵوێستەی د.شوكری سەگبان لەبارەی زمانی كوردی، هەمان هەڵوێستی سولەیمان نـەزیفی-یە كە ساڵی ١٩١٢، لە وەڵامی خوێندكارێكی كورد بابەتێك بەناوی (زمانی كوردی) بڵاو دەكاتـەوە و تێیدا دەنووسێ: ((زمانێك بەناوی زمانی كوردییەوە نییە))، بەقسەی ئەو زمانی كوردی بەشـێكی زاراوەیەكی ناشیرینی زمانی فارسییە. ئەو پێی وابوو هەر ئەم زاراوە ناشیرینەش ڕێـی لـەوە دەگـرت كە كۆمەڵگای كوردیش بە كۆمەڵگایەكی ناشارستانی وەسف بكـرێ. كوردەكـان ئەگـەر خوازیـاری پێشكەوتنن، پێویستە وەكوو لاز و چەركەسـەكان فێـری تـوركی بـبن. پێویسـتە كـورد یـەكگرتن و خۆتێكەڵكردن لەگەڵ توركەكاندا بە شەرەف و پێشكەوتنێكی گەورە بۆ خۆیان لەقەڵەم بدەن. بڕوانـە: ڕیفۆرم  و گۆڕانكارییەكان لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا- ڕۆژنامەی هـەق، ٤ی نیسـانی ١٩١٢“ زمـانی كورد، ڕۆژنامەی هەق، ٧ی نیسانی ١٩١٢، د. شوعەیب لـە كتێبـی (سـولەیمان نـەزیف)دا باسـی

بوو بە چڵی بەهێز و لقی پڕاوپڕ بە گەڵا و پەڵکی سەوزی یەك شێوە، ڕازاوە لێرەو لەوێ بەگوێرەی وەرزەکان، بە گوڵی جوان یا بەری بەتام، دەبێتە سۆنگەی بایەخ پێدانی خاوەنەکەیی و هەتا بێگانەکانیش. خۆ ئەگەر بەهۆی سەرمایەکی سەخت یا بەهۆیەکی دیکە، ئەو درەختە وشك بوو، ئەوا هەموو ئەوانەی هاوپێوەندن لەگەڵی دڵگران دەبن و فرمێسکی هاوپێوەندە هەرە نزیکەکانی وا پێدەچێ بۆ چاکبوونەوەکەی بڕژێ. لەکاتێکدا ڕەگەکەی تەنها بۆ بڕینەوە چاکە.

ئێمە دەزانین درەختێکی لە ڕواڵەتدا جوان، بەڵام کە بە پێچەوانەی بایۆلۆژی ئاسایی ڕووەکەکان، شەو و ڕۆژ ئۆکسجینی هەوا هەڵبمژێ و بە بێ وچانیش ترشی کاربۆنی بداتەوە و میوەی ژەهراوی ببەخشێتەوە، بێ گومان ئەو درەختە چارەنووسیی بڕینەوەیە. ئەوەی کە نامۆ و جێگەی داخ خواردنە، ئەو نەتەوانەن کە بایەخ بەو جۆرە درەختانە دەدەن و دەترسێن لەسەر زەوی لە جەستەی پاڵکەوتووی نزیك بکەونەوە بۆ ئەوەی خۆیان لە مەترسی خنکان ڕزگار بکەن. ژیانی گەلان لە چەند ڕوانینێکدا لەم درەختە دەچێ.

لە لایەکی دیکەوە، پەیڕەوکردنی پیتی لاتینی کە لەسەر ئەلفبێی لاتینی بیناکراوە یەکێك لە وەسیلە هەرە خێرایەکانی فێربوونی گشتیی و بڵاوکردنەوەیەتی بەناو هەموو تورکیادا[٤٦]. ئەو هەڵمەتە نایابەی کە دواتر لە ڕێگەی قوتابخانەی شەواندا کرا، بە شێوەیەکی

---

کردووە، بڵاوکراوەکانی وەزارەتی کەلتور و گەشتیاری، ١٩٨٨، ل٩٦-٩٧، لە کتێبی مالمیسانژ، *جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان ١٩١٢-١٩٢٢ (یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد)*، لەتورکییەوە وەرگێڕانی زریان ڕۆژهەلاتی، پێشەکی و پێداچوونەوەی عەبدوللا زەنگەنە، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل:٣١ ڕاگوێزراوەتەوە.

[٤٦] بۆ دابڕان لەگەڵ مێژووی سیاسیی ئیمپراتۆریای عوسمانی و بۆ (مۆدێرنیزەکردن!)ی تورکیای نوێ، ڕۆژی ٢٨ ی نۆڤەمبەری ١٩٢٨، مستەفا کەمال، دامەزێنەر و سەرکۆماری تورکیا، ئەلفوبێی لاتینی بەسەر زمانی تورکی سەپاند، کە ئەوە لە هەموو شتێك زیاتر بەزوویی و بە بێ هیچ

زۆر زیاد ژمارەی نەخوێندەوارەکانی لەناو وڵاتدا کەم کردەوە. هەموو ئەم ڕیفۆرمە بنچینەییانە و ئەو ئامانجانەی دەیانەوێ بیپێکن بە تەواوەتی ئێمە دووردەکاتەوە لەوەی بیر لە بەکارهێنانی زمانی کوردی لەناو پەروەردەدا بکەینەوە. ئەنجامەکە وەك ئەوەی چاوەڕوان دەکرا وابوو. بەمشێوەیە گەلی کوردیش خۆی پەروەردە دەکات. هەموو خەباتی ئێمە، هەموو ئەو خواستانە تەنها یەك تاقە ئامانجیان لەبەرچاوگرتبوو ئەویش ئامانجی ڕزگارکردنی کورد بووە لە کۆتی نەزانیی و هەژارییەکەی.

ئەو گەلەی کە خۆی فێردەکات دەکات و بە میتۆدە مۆدێرنەکان خۆی پێدەگەیەنێ بەردەوام خۆی دەوڵەمەند دەکات.

دەبێ دەستپاکانە دان بەوەدا بنێین کە باوەڕی ئێمە لەبارەی پێویستی پەروەردە (فێربوون) ی گەلی کورد بەهۆی زمانی خۆی دوای ئەم ڕاستییە پێگەیشتووانە هیچ شوێنێکی نابێتەوە. بەو پێیەش کەوا ڕای گشتی ئەم باوەڕەی وەرنەگرتووە و لای قەبووڵکراو نییە بۆیە بە باشمان زانی دەستبەرداری ئەم باسە ببین.

---

کێشەیەك لە لایەن دەستەی ڕوناکبیریی و سیاسیی کوردستانی باکوور و ڕۆژئاواوە پەسند کرا، (وەرگێڕ).

من له‌ پێشدا باسی چاره‌نووسی کورده‌کانی تورکیا ده‌که‌م. ئه‌مه‌ش له‌به‌ر ئه‌م دوو هۆیانه‌ی خواره‌وه‌:

یه‌که‌میان: کۆماری تورکیا تاقه‌ ده‌وڵه‌ته‌ که‌ زانیویه‌ به‌ سیاسه‌تێکی نایابی حه‌کیمانه‌ و دووربینانه‌ پرسی چاره‌نووسی که‌مینه‌نه‌ته‌وه‌ یۆنانییه‌کانی خۆی چاره‌سه‌ر بکات. گۆڕینه‌وه‌ی دانیشتوانه‌ تورکه‌کان له‌ یۆنان و دانیشتوانه‌ یۆنانییه‌کان له‌ تورکیا بێگومان زۆر سه‌خت بوو، به‌ڵام یه‌کجار دووباره‌ جێگیربوونه‌وه‌ و گه‌ڕانه‌وه‌ قازانجی بێ شوماری ده‌بێ

بەوەی کە دەگەڕێنەوە ناومالّی خۆیان. لەوساوە، حکوومەتی تورکیا و یۆنان بەرهەمی سیاسەتی پێگەیوی جوامێرانەیان دەچننەوە.

دووەمیان: کوردەکان لە تورکیا ژمارەیان زۆرترە.

بەلاّم ڕەنگە ئەوان پێمان بلّێن وەك دەلّێن ئێمە کەمینەنەتەوەی کورد ناناسین لای ئێمە. ئەمە لێرەدا باسی ئێمە نییە. ڕاستە کە لە هەموو بۆنەیەکدا دەولّەتدارە تورکەکان بە ئاشکرا و بە دەنگی بەرز ڕایان گەیاندووە کە " توخمی کورد لەگەلّ نەتەوەی تورك حوکمڕانی تورکیا دەکەن" بەلاّم ئەمە ڕاگەیاندنێکی یەکلایەنەی یەکیەتی سیاسیی تورکی-کوردە کە لەوەتای چوار سەدە دەبێت وەستانی بۆ نییە. من پێم وایە کە کوردیش دەبێ وەکو هاوبەش، بە هەمان ئاواز بە تەواوی ویستی خۆیی و هۆشیار بۆ پێداویستی ئەم یەکێتی سیاسیی و هەروەها یەکێتییە نیشتمانییە ڕابگەیەنێ. هەروەك ئەوەی چوار مانگ نابێ بەر لە ئێستە یەکێك لە پیاوە هەرە گەورەکانی دەولّەت، لەکاتی قسە و باسی لەبارەی دووبارە ڕێکخستنەوی یەکێك لە نەتەوە هەرە گەورەکان دەیووت: " بنچینەی دەولّەت تەنها یەکیەتی ڕەگەزە"

بۆیە کورد بەو پێیەی لە هەمان ڕەگەزی تورکەکانن، بە یەکبوونیان، نەتەوەی نوێی تورك دروست دەکەن کە خاوەنی ڕۆحێکی زیندوو دەبێ و لەوە بەدوا دلّی ئەوانە گەرم دەکاتەوە کە تەنها بۆ یەك تاقە ئیدیال لێدەدات. هیچ شتێك نییە ڕێگە لە یەکبوون بگرێ و بەمزوانە ئەم دوو گەلە ئامۆزایە یەکدەگرن. سەربار، تێکچرژانی داب و نەریت، هاوکات لەگەلّ یەکانیەتی ئایین، یەکگرتوویی ئابووریی لەنێوانیاندا، هاوشێوەیی دام ودەزگەی بەڕێوەبەری و قانوونی لەناو یەك بۆتەدا لەوتای چەندین سەدەیەکەوە بە شێوەیەك کە برێك جار بە حاستەم دەتوانین یەکیان لە ئەوی تریان جیابکەینەوە. ملکەچ لەژێر سەروەرێتی ئیمپراتۆریای عوسمانیدا، نەوە دوای نەوە لەژێر هەژموونی هەمان ترادسیۆن و هەروەها هەمان چارەنووسیی بەختیاری و ناخۆشی، شادی و میحنەتی هاوبەشدا بوون و بەتایبەتیش

هەمان پێکەوەژیانی کولتووری. ڕۆڵـی برایـەتی لـە چـەك* بێگومـان لـەم هاوپەیمانیەتـەدا بالاَدەست بووە. ئەم تێکەلاَوبوونە یەکبینیەی تورك و کورد ڕێگەی پێدوان و ڕێگەیان پێـدەدا سوودی ئەوەیان ببێ خاسیەتی تایبەتیی خۆیـان لـەناو گەنجینەیـەکی هاوبـەش کـە هـەمان نەتەوەی لێ پێك دێت تێکەلاَوبن.

لە ڕاستیدا: تورك، کورد، لێرەدا تەنها ناوی یەکەمین و تۆرانیی ناوی بنەماڵەکەیانە.

هەستی ڕەگەز و شانازیی تـۆرانیی بـوون بـەرەو دوارۆژێکـی درەوشـاوەتریان دەبـات لەوەی ڕابووردوو.

جیـا لـەوە، فاکتۆرگـەلی یەکانییـەتی سیاسـی و نیشـتمانیی ئـەم دوو گەلـە، وەك هاوکاری ئابووری، یەکانییەتی ڕەگەزی و ئایینی، کۆمیونیتەی کولتـوور، هتـد.، هـەروەها فاکتۆرێکی دیکەی زۆر بەهێزتر هەیە ئەویش کەسایەتیی بەرزی غازی یە.

بەڕاسـتی، ئـەوە جێگـەی شـادومانییە، ئـەوە سـەرمایەیە بـۆ نەتەوەیـەك کـە سەرکردەیەکی وەك غازی موستەفا کەمال لە لووتکـەی حوکمڕانیـدا بێـت. کـەس نـاتوانێ نکۆڵی لەو چاکسازییە مەزنانە بکات کە لە تورکیادا کردوویە. ئەوە شکۆمەندییێکە بۆ ئـەو کە هەرگیز سیس نابێ و بەهیچ کلۆجێ لەگەڵ زەمەندا ناسرێتەوە.

وەك هـەموو مرۆیێکـی وەفـادار، کاریگـەر بـە شـوێنپایەی قـووڵ و بـە شـەیدایی لەبەرامبەر کارە گەورەکانی غازی بە ڕێزەوە دەچەمێمەوە بەو هیوایەی کە ئەوانە بۆ وەچـەی دوارۆژ بە خێر و خۆشی بشکێنەوە.

من لە شوێنی خۆمەوە بە شیاوی دەزانم بانگەوازێکی گـەرم ئاڕاسـتەی دەسـتەبژێری گەلی تورك بکەم کە بە تەواوی لەو پەیامە شەریفە دەگات کە کەوتۆتە سەر شانی مـن کـە

---

* *fraternité d'armes* : موخاه في السلاح : مەبەست لەوە برێتییە لە هاوبەشایەتی دوو یان گروپگەلێکی سەربازی یان ئەسپسواری، کە وێرای هەموو ئاستەنگێك یەکگرتوو دەبن بۆ هەتاهەتایە و کۆمەگی یەکتری دەکەن، (وەرگێڕ).

بریتییە لە سڕینەوەی یادەوەرییــە بــە ســوێیەکانی ڕابــووردوویێکی نزیــك و لــە بیرکردنــی بەوجۆرەی کە تێیدا ڕوداوە هەرە خوێناوییەکان و هەرە شەرمهێنەکان مێژووی هاوبەشــیان دووکەرت کردبوو و دووبــارە وڵات ڕێکبخەنــەوە، لــەژێر چــاوەدێری بــەرزی غــازی، ڕۆحــی کلێپەسەندووی نەتەوەی نوێی تورك، بەهرە لە خێر و خۆشی کۆمارەکەیان وەربگرن.

بەمشێوەیە لەژێر ڕوناکی ئەم بیرکردنەوە ڕاشکاوانەیدا، بە بێ ڕای پــێش وەختانــە و هەروەها بە بێ هیچ پشتە-نیازێك بانگەوازی برایانی هاوخوێنم، کوردەکانی تورکیــا دەکــەم، بە شوێن ئــەو ڕێچــکەیەوە بچــن کــە ســەرکردەی بــەناوبانگیان، موســتەفا کــەمال پاشــا، بەشێوەیەکی هەرە شایان بۆی دیاریکردوون، کە تێیــدا ئــارامی ڕۆح و خۆشــگوزەرانی تێــدا دەبیننەوە.

لێرەدا مەبستم لە بەشوێن داچوونی ڕێچکەی سەرکردە و پیاوی چارەنووســازی تورکیــا ئەوەیە: دابڕانی حەتمی و سیستماتیکیانەیە لەگــەڵ ڕابــوردوو، کــە تاقــە یــەك ئیــدیال بــۆ سەرلەبەری نەتەوەیەك پــەروەردە دەکــا بــە ئاڕاســتەی دووبــارە داڕشــتنەوەی ڕوحانیــەت و مۆنتالیتیەکەی دەبووژێنێتەوە، دووبــارە ڕێکخســتنەوەی وڵات و دەوڵەمەنــدکرنی نەتــەوە بەوەی بە بەرفراوانی سوود لە بەهرەی نوێی زانستە هاوچــەرخەکان وەربگــرێ و بەمشــێوەیە تورکیای نوێ دەخاتە ناو گروپی دەوڵەتگەلی کولتوورییەوە.

پێم وایە ئێستە بەم پیشاندانە کورتەم لــە هــەمان کــات بــە ئــەرکی سەرشــانی خــۆم هەڵساوم بەرانبەر ئەو هاوخەباتکارانەم کە بەوە گوناهباریان دەکردم تورکیام بەجێ هێشــتووە دوای ئەوەی بەشداریم لە جۆشدانی ناسیۆنالیزمی کوردی کردووە.

بەو هیوایەی کە خوێنەرانی ئەم کورتە بەرچاوخستنەدا وای ببینن کــە بــەدەر بــێ لــە هەموو بیرکردنەوەیەکی پێش وەختە، بە بێ ئەوەی بوونی واقیــع گــەلێکی هەمیشــەیی لــە ژیانی نیشتمانییدا لە یــاد بکــەن. لــەم هــەل ومەرجانــەدا، بێگومــانم لــەم ڕەوشــەدا هــەتا دوژمنانی سەرسەختیشم بوارێکی هەر تێدا دەبیننەوە بۆ ئەوەی پتر سینگفراوانتر بن.

هەرچی سەبارەت بەو کوردانەیە کـە لـە دەرەوەی تورکیـادا دەژیـن، بـە ڕاشـکاوی ڕاهاتووی خۆمەوە دەڵێم تەنها ئەوەیان بۆ هەیە بە ژێری لەگەڵ هەموو ئەو ڕەگەزانە بژین کـە ئەو دەوڵەتانە پێك دەهێنن کە تێیاندا دەژیـن، هـیچ چەشـنە گیروگرفتێـك بـۆ حکوومەتـە تایبەتییەکانیان دروست نەکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە تەواوی ویستی چاکەیان بەدیاربخـەن و بەشداری لە پێشخستنی ئابووری و کولتووریی وڵاتەکەیان بکەن.

ئەوەیان چاکترین و شیاوترین چارەسەرە کە بتوانین بۆ چارەسـەرکردنی کێشـەی کـورد بیخەینە ڕوو.

هیوادارم کەوا گەلانی خاوەن پێوەند بەمزووانە بەرهەمی پێگەییو بچننەوە.

هەرچی سەبارەت بە خۆمە، لە ئاسۆیەکانی باشترین دوارۆژ بۆ کۆنە هاوخەباتکارەکانم لەودیوو سنوورەکان ڕادەمینیم، لە کۆششی تورکیا بەرەو خۆشگوزەرانیی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسیی و دەڵێم ماڵئاوا* ژیانی سیاسییم.

**تەواو**

* بای بای

## بەڵگەنامەی ژمارە: ١

(کۆپی)

ئەستەموول، ٦ ی ئایاری ١٩٢٠

بۆ بەڕێز جەنابی کۆمیسێری بەرزی بریتانیای فەخیمە، هتد، هتد.

جەنابی بەڕێز،

شەرەفی ئەوەم هەیە جەنابتان لەوە ئاگادار بکەمەوە کە ئەو کەسانەی وا ناویان لەناو ئەم لیستەیەی خوارەوەدا هاتووە، هەر تازە کۆمەڵەیەکی نوێی کوردییان بە ناوی (کۆمەڵەی ئیجتیماعیی کورد) [جەمعییەتی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد ]ەوە دامەزراندووە. بێگومان جەنابی بەڕێزتان لەوە بێ ئاگانین کەوا ماوەیەکە چەند سەرگەردانییەك لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەی پێشووی کورددا لەنێوان لایەنگیرانی سەربەخۆیخواز و ئەوانەی کە بە چارەسەری نیوەچڵ ڕازین، دەبینرێ. ڕووناکبیرانی ژمارە زۆر بەوەی نەیاتوانی بەرگەی ئەم دوودڵییەی کە لەناو ئەو سیاسەتەی ئەمڕۆدا خۆی دەسەپێنێ، بگرن، بەو پێیەی کە بێهوودە هەموو ڕێگەیەکی ئاشتبوونەوەیان تاقیکردەوە، بڕیاریاندا خۆیان لە کۆمەڵەی کۆن جیا بکەنەوە و دەستبەرداری ڕابووردووی کۆمەڵە بن. ئەوانە هەر ئێستە هاتوون ئەم کۆمەڵە نوێیەیان دامەزراندووە.

ئێمە هیواداریین ئەم کۆمەڵەیە بەختی ئەوەی هەبێ ببێ بە جێگەی باوەڕی ئێوە و هیواداریین پشت قایم بەم پاڵپشتییە بتوانین، وێڕای هەموو چەشنە تەگەرەکان ئیدیالی نەتەوەییمان بەجێ بهێنین. بەوپێیە پێشەکی سوپاسی جەنابی بەڕێزتان دەکەین بۆ کۆمەگی گرانبەهاتان و ئەو بەخششانەی بە ئێمەتان دان، من تکاکارم ڕێزلێنانی لە هەموان شایانترم قەبووڵ بفەرموون.

سکرتێری گشتیی

کۆمەڵەی ئیجتیماعیی کورد

(ئیمزا) مەمدووح سەلیم بەگ

**

*

ئەوەیان لیستی ئەندامەکانی بیرۆی کۆمەڵەی ئیجتیماعیی کورد-ە:

عەبدوڵڵا جەودەت بەگ (خارپووت)، پزیشك و ڕۆژنامەنووس

شوکری بەگی بەبە (سلێمانی)، سەرنووسەری ڕۆژنامەی "تەرجومان"

شوکری محەمەد بەگ (دیاربەکر)، پزیشك

جەلادەت بەگ بەدرخان (دیاربەکر)، نووسەر

ئەکرەم جەمیل بەگ (دیاربەکر)، دیپلۆمی قوتابخانەی بەرزی شاهانە

ئەمین عالی بەگ (دیاربەکر)، موفەتیشی پێشووی گشتیی داد

حوسێن حامی بەگ (ئۆرفە)، پارێزەر

مەمدووح سەلیم بەگ (وان) نووسەری ڕۆژنامەی "ژین"

نەجمەددین حوسێن بەگ (کەرکووك) کۆنە مامۆستای ئایینی

بارەگای کاتی: نووسینگەی ڕۆژنامەی "ژین"،

شەقامی ئەبول سعوود*، نزیکی بابی عالی

---

* Rue Aboussound

بەڵگەنامەی ژمارە: 2

سێرڤیسی زانیاریی زەریاوانیی

تورکیا

(هەڵبژاردەی چاپەمەنیی ژمارە ٣٤٥ی ١٣ی ئایاری ١٩٢٠)

# کۆمەڵەیەکی نوێی کوردی

جەمعییەتی ئیجتیماعیی کورد[*]

١٣ی ئایاری ١٩٢٠

ئەمین عالی، دکتۆر شوکری محەمەد، بابان زادە حوسێن شوکری و مەمدووح سەلیم بەگ هەر ئێستە ڕێکخراوێکی کوردییان بە ناوی جەمعییەتی ئیجتیماعییەی کوردەوە دامەزراندووە. ستاتووی ئەم ئەم ڕێکخراوە نوێیە دراوە بە وەزارەتی ناوخۆ.

ڕۆژنامەی
Le Moniteur oriental

---

[*] La ligue sociale Kurde

بەڵگەنامەی ژمارە: 3

# کۆمیتەی خۆیبوون

سەرکردایەتیی گشتیی سوپا

بەشی زانیاری

بیرۆی دووەم

- نهێنی -

*(سەرچاوەیێکی چاك)*

٢٥ *ی تەمووزی* ١٩٣٢

کۆمیتەی " خۆیبوون" چیدی لقی لە عێراقدا نییە، کە لەوێدا دەسەڵاتی خۆیبوون لە ١٩٢٩ —ەوە دانی پێدا نەنراوە. ئەو سەردەمانە لقێکی خۆیبوون بە چاودێریی دکتۆر شوکری محەمەد و مستەفا شەوقی ئەفەندی، (کۆنە ئەفسەری کورد) و ئیسماعیل ئەفەندیی ڕەواندوزی (کە ئێستە لەناو ڕیزەکانی سوپای عیراقدا ئەفسەرە) هەبوە.

هەڵبەتە کۆمیتەی خۆیبوون نوێنەری زانیاریدەری لەناو سوپای عیراقدا هەر هەیە، لەوانە ئیسماعیل ئەفەندی ڕەواندزی.

بەڵگەنامەی ژمارە: 4

# لیستی فرەنسیی ناوی ئەندام و لقەکانی خۆیبوون*

**• کۆمیتەی ناوەندی لە بەیرووت**

سەرۆك: - کامەران عالی بەدرخان

ئەندامەکان: - نەجمەددینی درویێش کبار

- واهان پاپازیان

- تارلەبە بەگ

- خالید بەگ، ئامۆزای بەدرخانەکان

---

* ئەم لیستە لەم سەرچاوە فرەنسییە وەرگیراوە:

-*La Ligue national kurde Khoyboun*, Documents receillis, annotés et présentés par Jordi Tejel Gorgas, Etudes Kurdes, N° hors série III-juin 2007, Paris, pp: 35-37.

**●دیمەشق**

سەرۆك: - جەلادەت عالی بەدرخان

ئەندامەکان: - عومەر ئاغا شەمسەددین

- یووسف ئاغا

- عوسمان عرووسی

- ئیبراهیم شەمدین

**●حەڵەب**

سەرۆك: - قەدری بەگی جەمیل پاشا

ئەندامەکان: - هیرات پاپازیان

- مستەفا بەگ شاهین

- بۆزان بەگ شاهین

- هەمزە ئەفەندی

- مەمدووح سەلیم

**● حەسەکە**

سەرۆك: - قەدری بەگی جەمیل پاشا

ئەندامەکان: - محەمەد بەگی جەمیل پاشا

- حاجۆ ئاغا

- هەمزەی کوڕی بەکر کوردی

- ئەلیاس ئەفەندی دێریکاوی

- کادوور بەگ

- ڕەسووڵ ئاغا

- ئاگۆپ سیمۆن

● **ماردین (تورکیا)**

سەرۆك: - ئەیووب مللی زادە

ئەندامەکان: - سەعدۆ ئاغا غەسۆ (سەرۆکهۆزی "مەشکینا").

- جەلال بەگ مللی زادە

- د. زەحیا بەگ، سەرۆکی شارەوانیی ماردین

- مەحموود کارۆ، سەرۆکی هۆزی "خورس"

● **دیاربەکر**

سەرۆك: - مەمدووح بەگی جەمیل پاشا زادە

ئەندامەکان: - فکری بەگی جەمیل پاشا زادە

- ئەحمەد بەگی جەمیل پاشا

- زیا بەگی جەمیل پاشا

- برنجی زادە صدقی بەگ

- شەوقی ئەفەندی

● **سلیوان**

سەرۆك: - عەلی ئاغا، سەرۆکهۆزی سلیوان

ئەندامەکان: - ئیبراهیم بەگ

- خەتیب بەگی صفیالدین پاشا

- شێخ فکری

- شێخ فەوزی، سەرۆکهۆزی سیلوان

● **سەحوور**

سەرۆك: - نەجمەددین بەگ

ئەندامەکان: - مەمدوڵلا بەگ، هۆزی خەشنێ

- محەمەد بەگ، هۆزی خەشنێ

- حەمدی بەگ، هۆزی خەشنێ
- شێخ فەتحوڵڵا، سەرۆکهۆزی مالمیێ

• سێرت

سەرۆك: - سەییید محەمەد
ئەندامەکان: - شێخ جەلال
- شێخ نەسرەت ئەفەندی
- شێخ موحیەددین زوکریت
- شێخ ئازارت، سەرۆکهۆزی بۆتکی

• بەغدا (عیراق)

سەرۆك: - د. شوکری محەمەد
ئەندامەکان: - شێخ ئەحمەد، ئامۆزای شێخ سەعید
- کریکۆر ئەفەندی
- خورشید، کۆنە ئەفسەری تورك [خورشید ڕەشید وانلییە]
- عەبدولکەریم بەگ، کۆنە کاپیتانی تورك [کەریم مەحموود ڕۆستەمی ناسراو بە کەریم شالوومە]

• کەرکووك

سەرۆك: - مەحموود جەودەت، کۆنە ئەفسەری تورك
ئەندامەکان: - ڕەشید بەگ
- ڕەئووف بەگ، ئەفسەری کوردی عیراق
- ٢ کەس کە ناوەکانیان نەتوانرا بناسرێنەوە
- عەبدولکەریم بەگ، کۆنە کاپیتانی تورك

● **سلێمانی**

سەرۆك: - تۆفیق وەهبی بەگ

● **زاخۆ**

سەرۆك: - حازم بەگ نایبی زاخۆ

ئەندامەكان: - موراد خان، سەرۆكهۆزی گۆیان

- محەمەد حەسەن
- لیڤۆن پاشا
- سەعید پاشا

● **ڕەواندوز**

سەرۆك: - شێخی بارزان

ئەندامەكان: - ئیسماعیل بەگ

- سەیید حوسێن حوزنی، بەڕێوەبەری گۆواری كوردیی "زاری كرمانجی"
- عەبدوڵڵا بەگ، ئامۆزای سەیید تەها [عەبدوڵڵا بەگ كوڕی سەیید عەبدولقادری نەهرییە]

● **پاریس**

نوێنەرایەتی - شەریف پاشا

● دێترویت مەشینگان

سەرۆك: - د. سورەیا بەگ بەدرخان

ئەندامەكان: - ناجی بەگ

- جەمال بەگ

● **لەندەن**

سەرۆك: - ڕەئووف بەگ، كۆنە سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیرانی توركیا

ئەندامەكان: - عەدنان بەگ

- میبران خانوم

# بیۆگرافیا

• ئەکرەم جەمیل پاشا ( ئامەد ١٨٩١/٢/٢٢-شام ١٩٧٤/١٢/٣١). پیاوی سیاسیی و خەباتکارێکی دەستەی یەکەمی کاروانی بزووتنەوەی کوردایەتی و لە بنەماڵەکی ئارستۆکرات لە دایك بووە. یەکێك لە دامەزرێنەرەکانی جڤاتا هیڤێی قوتابیانی کورد (١٩١٢) و ئەندامی جەمعیەتی تەعالیی کوردستان (١٩١٨) و خۆیبوون (١٩٢٧) و ئەندامی کۆمەڵەی کۆمەگی و یارمەتیدانی کوردە هەژار و بەلەنگازەکانی جەزیرە (١٩٣٣) بوو. لە ١٩٣٩ تاوەکو ١٩٤٦ نوێنەری خۆیبوون بووە لە شام.

***

• تۆفیق وەهبی (سلێمانی ١٨٩١-لەندەن٥ی کانوونی دووەمی١٩٨٤). سیاسەتوان، نووسەر و زمانەوانی کوردە. لە بەغدا ئەعدادییەی عەسکەری تەواو کردووە و دواتر کولیەی حەربییە لە ئەستەموولّ تەواو دەکات و لە ڕیزی سوپای عوسمانی بەشداری لە شەڕەکانی بالقان و جەنگی یەکەمی جیهانیدا کردووە. ساڵی ١٩١٩ گەڕایەوە عێراق و کرایە قایمقامی ڕانیە. ساڵی ١٩٢١ لەگەڵ دامەزراندنی سوپای عێراق چووەتە ناو

سوپای عێراق و دواتر پێوەندی بە بزووتنەوەی شێخ مەحموود دەکات ( ١٩٢٢ ) و دواتر پاش گرتنەوەی سلێمانی ساڵی ١٩٢٣ تۆفیق وەهبی دەچێتە بەغدا و گەلێك پۆست و پلەی پایەبەرزی لە حکوومەتی عێراقی وەرگرتووە. ساڵی ١٩٣٠ بۆ ماوەیەکی زۆر کورت پارێزگاری سلێمانی بووە و چەندین جاریش وەزیری حکوومەتەکانی عێراق بووە. (١٩٤٤-١٩٤٦)، (١٩٤٧-١٩٤٨). بەر لە کودەتای ١٩٥٨ دەچێتە لەندەن و تا دوایین ڕۆژەکانی ژیانی هەر لە لەندەن ماوەتەوە و لەسەر ڕاسپاردەی خۆی تەرمەکەی هێنرایەوە کوردستان و لە پیرەمەگروون نێژرا.

***

●جەلادەت بەدرخان (١٨٩٣سووریا-١٩٥١). کوڕی ئەمین عالی، کوڕی گەورەی میر بەدرخان بەگە. دیپلۆمی لیسانسی یاسا لە ئەستەموولٚ وەردەگرێ و دواتر خوێندن لە ئەڵمانیا تەواو دەکات و ساڵی١٩٢٧ بە سەرۆکی کۆمەڵەی خۆیبوون هەڵدەبژێرێ. یەك لە پیاوە دیپلۆمات و چالاکەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بوو. دوای شکستی بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی باکوور پەڕیوەی شام دەبێ و خۆی زیاتر بۆ کاری کولتووری تەرخان دەکات.

***

● حاجۆ ئاغا (میدیەت ١٨٨٠-دێرزوور ١٩٤٠). سەرۆکهۆزی هەڤێرکیانە، لە شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ بەشدار دەبێ و پاشان پەڕیوەی شام دەبێ. ئەندامی دامەزرێنەری خۆیبوونە و چالاکانە لە سییەکاندا بەشداری لە ژیانی سیاسیی بزووتنەوەی کورد دا دەکات و داوای ئۆتۆنۆمی جەزیرەی سەرووی دەکرد.

***

●ڕەفیق حلمی (١٨٩٨-١٩٦٠/٨/٤). مێژوونووس، شاعیر، ڕۆژنامەوان و وەرگێڕی کوردە لە شاری کەرکووك لە دایك بووە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە کەرکووك و سلێمانی و ئامادەیی لە بەغدا تەواو کردووە. پەیمانگەی ئەندازیاریی لە ئەستەموولٚ تەواو کردووە و ساڵی ١٩٢٠ گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان. لە دووەم حکوومەتی شێخ

مەحموودی حەفید، ڕاوێژکاری سیاسیی مەلیك مەحموود بووە، لە ڕاپەرینی بەردەرکی سەرا (١٩٣٠) یەکێك لە بەشداربووەکان بووە و دوای ئەوە ماوەیەك زیندانی کراوە. سەرۆکی حیزبی هیوا بووە (١٩٣٩-١٩٤٤) کە یەکێك لە گەورەترین و جەماوەری ترین پارتی سیاسیی کوردستانی عێراق بووە لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگدا. لە گرینگترین بەرهەمەکانی: یادداشت (٧ بەرگ)، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی (٢ بەرگ)، خولاسەی مەسەلەی کورد (وەرگێران لە فرەنسییەوە) و پاش تەمووز (شیعر).

***

● سەیید عەبدولقادری شەمزینانی ( ١٨٥١- دیاربەکر ١٩٢٥). سەرکردەی ئایینی و سیاسیی کوردبوو. کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییە، پیاوی سیاسیی عوسمانی و سیناتۆری وان بوو. ساڵی ١٨٨١ دوای تێکشکانی ڕاپەرینی ساڵی ١٨٨١ لەگەڵ باوکیدا ڕەوانەی مەککە دەکرێ و ساڵی ١٩٠٨ دوای کودێتای تورکە-لاوەکان هێنرایەوە بۆ ئەستەموول. یەکێك لە لایەنگرەکانی تێزی ئۆتۆنۆمی بوو بۆ کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا و دواتر لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی کەمالیزم (لە دەورانێکی زۆر زوو)دا دژی ئەوە بوو کە کورد دژی تورك چەك هەڵبگرێ. ساڵی ١٩٢٥ بە بیانووی بەشداریکردن لە شۆڕشی ١٩٢٥دا بەدیلگیرا و دواتر لەسێدارە درا.

***

●سمکۆی شکاك (١٨٨٧-١٩٣٠/٦/٢١). کوڕی ئیسماعیل ئاغای کوڕی محەمەد پاشای کوڕی عەلی خانی کوڕی ئیسماعیل ئاغای هۆزی شکاکە. لە بنەماڵەیەکی خانەدانی شکاك لە چەهریق لە نزیك باراندوز لە دایك بووە. ژیانی سیاسیی سمکۆ دوای کوشتنی جەوهەر ئاغای براگەورەی (سەرەتای حوزەیرانی ١٩٠٥) دەست پێدەکات. بەگوێرەی برێك سەرچاوەی مێژوویی سمکۆ لە شاری سەلماس و خۆی بەشداری لە قەتڵوعامکردنی ئاسوورییەکان کردووە و نزیکەی دە هەزار ئاسووری

کووشتووه. لە بەهاری ١٩١٨ تاوەکو ساڵی ١٩٢٢ بەشێکی گەورەی ڕۆژئاوای ورمێ لە ئازەربایجانی ئێران لەژێر کۆنترۆڵی سمکۆدابووە. سمکۆ ١٧ ی ئاداری ساڵی ١٩١٨ پاتریارشی ئاسوورییەکان (مارشەمعوون) تیرۆر دەکات، کە دەبێتە سۆنگەی دوژمنایەتی کورد و ئاسووری. ساڵی ١٩٢٢ لە بەرامبەر هێرشی سوپای ئێران ڕا دەکاتە تورکیا و ساڵی ١٩٢٤ بە لێبوردنی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ ئێران، بەڵام ساڵی ١٩٢٦ جارێکی دیکە دەست بە شۆرش دەکاتەوە و دیسان بە تێکشکاوی پەنا دەباتەوە بەر تورکیا. ماوەیەك لەنێوان بەشەکانی کوردستانی تورکیا و کوردستانی عێراق دەمینێتەوە و حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٠، جەنەڕاڵی ئێرانی، حەسەن موقەدەم، نامەیەك بۆ سمکۆ دەنێرێ، کە ئەوکات سمکۆ لەناوچەی بارزان بووە و داوای لێدەکات بۆ گفتوگۆ و دیدەنی سەردانی شنۆ بکات. سمکۆ بەوە ڕازی دەبێت و دەکەوێتە داوەکە و دواجار ڕۆژی ٢١ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٠ لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە تیرۆر دەکرێ.

***

● سەلاحەددین ئەیوبی (دیون١١٣٧-دیمەشق١١٩٣). ناوی تەواوی یوسفی کوری نەجمەددین ئەیوبە و لە بنەماڵەیەکی کوردی لە هۆزی ڕەوادی لە دایك بووە. سەرکردەیەکی گەورەی ئیسلامی و دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەیوبییە کە دواتر میسر، شام، حیجاز و یەمەنی خستە ژێر قەڵەمڕۆی دەسەڵاتی ئیسلامی عەباسییەوە. دەوڵەتی خەلافەتی فاتیمیەی لە میسر لەناوبرد و لە شەری خاچپەرستەکان سەرکردایەتی سوپای ئیسلامی کرد بۆ گێڕانەوەی خاکی پیرۆزی قودس لە دەستی خاچپەرستەکان. سەڵاحەدین بە لێبوردەیی و هەڵسوکەوتی نەرم و مرۆڤانەی لەگەڵ دوژمنەکانی بەناوبانگە کە ئەمە وێنەی سەڵاحەدینی لای دوژمنەکانیشی ناشرین نەکردووە.

***

● سولّتان سەلیم یاوز خان (ئەماسییە ١٤٧٠/١٠/١٠-ئەستەموولّ ١٥٢٠/٩/٢٠). سولّتان سەلیمی یەکەم (ناسراو بە سولّتان یاوزخان "جەسوور"، "تۆقێنەر". نۆیەمین سولّتانی ئیمپراتۆریای عوسمانی و یەکەمین هەڵگری نازناوی خەلیفە بوو (لەوەتای سالّی ١٥١٧-ەوە) کوڕی سولّتان بایەزیدی دووەمە. سەلیم یاوزخان لە لایەن باوکییەوە سەرەتا کرا بە حاکمی ترابزۆند بۆ ئەوەی لەگەڵ کاری بەڕێوەبردنی ولّات ڕابێت و سەرکردایەتی هەڵمەتە سەربازییەکان بە ئەستۆ بگرێ. سەلیم یاوز هەرزوو پێوەندیەکی توند و تۆڵی لەگەڵ سوپای ئینکشاری دروست کرد و ڕایەڵەیەکی توندی جاسووسکاری لە سەرتاپای ولّات دانا و یەکەمین جار کەوتە پەلاماردانی جۆرجیا. لە ٢٥ ی نیسانی ١٥١٢ لە دژی باوکی یاخی بوو و برا و ئامۆزایەکانی کوشت و دەستی بەسەر عەرشی دەسەلّاتدا گرت. لە نیسانی ١٥١٤ پەلاماری ئێرانی دا و لە جەنگی چالدێران (٢٣ ی ئابی ١٥٤١) شا سمایلی سەفەوی زۆر بە توندی شکاند و چل هەزار عەلەوی قەتلّوعام کرد. دواتر دەستی بەسەر ناوچەکانی ئانادۆل و میزۆپۆتامیا و کوردستاندا گرت. لە سۆنگەی هاوپشتی مەملوك و سەفەوییەکان لە حوزەیرانی ١٥١٦ بۆ لەشکرکێشی بۆ سەر میسر بەرێکەوت. ڕۆژی ٢٨ ی ئاب سەلیم یاوز گەیشتە حەلّەب و ڕۆژی دواتر لە نوێژدا وەکو خەلیفە ناوی هێنرا و خۆی بە خەلیفەی موسلّمانان ناساند. دوای ئەوەی سوریا و لوبنانی داگیر کرد و لەماوەی سیانزە ڕۆژدا بیابانی سینای بڕی. نیسانی ١٥١٧ دەسەلّاتی مەملوکی لە میسر ڕوخاند. ٦ ی حوزەیرانی ١٥١٧ مەککە و مەدینە بوون بە بەشێك لە خاکی عوسمانی. سولّتان یاوز ماوەی هەشت مانگ لە میسر مایەوە و لە ٢٥ ی حوزەیرانی سالّی ١٥١٨ گەڕایەوە ئەستەموولّ.

***

●شەریف پاشا ( ئەستەموولّ ١٨٦٥- ناپۆلی ٢٢-١٢-١٩٥١). دیپلۆمات و پیاوی سیاسیی کوردە و لە بنەماڵەیەکی نەجیبزادەی کورد لە دایك بووە. ساڵەکانی

١٨٧١-١٨٧٥ له سلێمانی دەچێته بەر خوێندن و ساڵەکانی ١٨٧٦-١٨٨٤ لە ئەستەمووڵ و دواتر لە ١٨٨٥ تا ١٨٩٤ لە پاریس لە قوتابخانەی سەربازی -Saint Cyre درێژە بە خوێندن دەدا. لە ساڵی ١٨٩٤ تا ١٩٠٨ دەبێتە باڵیۆزی حکوومەتی عوسمانی لە ستۆکهۆڵم. دوای کۆدەتای ساڵی ١٩٠٨ ی تورکە لاوەکان دەگەڕێتەوە ئەستەمووڵ و لەگەڵ ئەمین عالی بەدرخان و سەیید عەبدولقادر جەمعیەتی تەعالیی و تەرەقی کوردستان دادەمەزرێنن، بەڵام شەریف پاشا هەر لە هەمان ساڵدا دەگەڕێتەوە پاریس و سەرەتا لە پاریس و دواتر لە مۆناکۆ نیشتەجێ دەبێ و ساڵی ١٩١٩ دەبێتە سەرۆکی وەفدی کوردستان بۆ کۆنفرەنسی ئاشتی و لە ٢٤ ی نیسانی ١٩٢٠ بە هۆی دەردە کورد وازدەهێنێ.

***

• شێخ سەعیدی پیران (پالۆ ١٨٦٥-دیاربەکر ١٩٢٥). پیاوی ئایینی و سیاسیی کوردبوو. دوای مردنی باوکی (شێخ عەلی سەپتی: لە تەریقەتی نەقشبەندی) شێخ سەعید چووەتە لای شێخ مەحموودی مامی. بەمشێوەیە بە چاودێریی مامی خوێندنی ئایینیی تەواو کردووە. لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٤-ەوە سەرکردایەتیی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی لە کوردستانی باکوور گرتووەتە دەست. شوباتی ١٩٢٥ لەگەڵ هەزاران لە شوێنکەوتووەکانی گەیشتە پیران، هەرێمی دیاربەکر. لە سۆنگەی پێکداهەڵپرژانێك لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ناوچەکە، شۆڕش لە (٨)ی شوباتی ١٩٢٥ بەرپا بوو و بە زوویی زۆرترین بەشی کوردستانی باکووری گرتەوە. پێشمەرگەکان هەتا بن دەرگەی دیاربەکر چوون، بەڵام شۆڕش سەرنەکەوت و دواتر زۆر بێڕەحمانە شۆڕشەکە لە لایەن سوپای تورکیا بە ئاگر و ئاسن دامرکێندرایەوە. شێخ سەعید لەدوای شکستهێنانی شۆڕشی چەکداریی (١٩٢٥) لەگەڵ چەند هاوەڵێکیدا لەسەر ئەوە بوون بگەنە ناو سنووری ئێران، کاتێك ڕۆژی ١٥/١٤ ی نیسانی ١٩٢٥ دوای تۆپبارانێکی توند، خۆیی و ( ٢٤) کەس لە هەڤاڵانی لەسەر پردی عەبدولڕەحمان پاشا لە وارتۆ خۆیان بەدەستەوە دەدەن، شێخ سەعید بە دیل گیراوی هێنرایەوە دیاربەکر و لە دادگەی

سەربازیی دیاربەکر سزای لەسێدارەدانی بەسەردا سەپێندرا و ڕۆژی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٢٥ لە دیاربەکر لەگەڵ ٤٩ لە هاوەڵەکانیدا لەگۆڕەپانێکی ناو شاری ئامەد لەسێدارە درا.

***

• شێخ مەحموود حەفید زادە (سلێمانی ١٨٨١-بەغدا ٩-١٠-١٩٥٦). ڕێبەری ئایینی و پیاوی سیاسی کوردە. لە بنەماڵەیەکی ئایینی و کوردپەروەر گەورە بووە و کوڕی شێخ سەعیدی بەرزنجییە. خوێندنی ئایینی لە سلێمانی تەواو کردووە. لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی بەتەك عوسمانییەکان جەنگاوە. ساڵی ١٩١٨ بە ناوی ئینگلیزەوە حوکمڕانی ناوچەی سلێمانی کردووە و بەڵام هەر زوو ساڵی ١٩١٩ دژی ئینگلیز وەستاوەتەوە. دوای بە دیل گرتنی ساڵی ١٩١٩، لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٢ گەڕایەوە سلێمانی و بوو بە سەرۆکی حکوومەتی کوردستانی جنووبی تا ساڵی ١٩٢٤. دوای بەستنەوەی یەکجارەکی ویلایەتی موسل بە عێراقی تازە دروستبوو، پەنای بردۆتە بەر ئێران و تا ساڵی ١٩٣١ هەر لەشەڕی حکوومەتی عێراق و بریتانیا بووە و دواتر دوورخراوەتەوە بۆ بەغدا، ناسریە و بەسرە تا دواجار لە دوورەوڵاتیدا و لە بەغدا دوا هەناسەی ژیانی دا.

***

• عەبدوڵڵا جەودەت (دکتۆر) (عەرەبگیر ٩ ی سێپتامبەری ١٨٦٩-ئەستەموول ٢٩ ی دیسامبەری ١٩٣٢). نووسەر، وەرگێر و پیاوی سیاسیی کوردە. دوای خوێندنی سەرەتایی لە ئەلعەزیز لە قوتابخانەی سەربازی ڕوستییە فڕەنسی، عەرەبی و فارسی دەخوێنێ و دواتر دەچێتە ئەستەموول و قوتابخانەی سەربازی تەواو دەکات و سێ ساڵ دواتر دەچێتە کۆلیژی پزیشکی. ساڵی ١٨٨٩ دەگەڕێتەوە کوردستان بۆ دیاربەکر و لەگەڵ هاوڕێیەکانی کۆمیتەی عوسمانی دادەمەزرێنێ و ساڵی ١٨٩٣ بەهۆی چالاکی سیاسیی زیندانی دەکرێ. ساڵی ١٨٩٤ دەبێتە پزیشکی چاو لە نەخۆشخانەی

حەربییەی ئەستەموولّ. دواتر هێندە نابات لەسۆنگەی کاری سیاسیی ئاوارەی لیبیا و دواتر ژنێف دەبێت. یەکێك لە دامەزرێنەرانی کۆمیتەی ئیتحاد و تەرەقی بووە، ساڵی ١٩٠٥ لە میسر پارتی دیمۆکراتی عوسمانی دادەمەزرێنێ و ساڵی ١٩١٠ دەگەڕێتەوە ئەستەموولّ و لێرەوە دەست دەکات وتار لەسەر کورد بڵاودەکاتەوە و نووسەرێکی بەبەرهەم بوو و نزیکەی چل کتێبی نووسیوە.

***

● کامەران عالی بەدرخان (ئەستەموولّ ٢١ ی ئابی ١٨٩٥- پاریس ٤ی دیسامبەری ١٩٧٨). نووسەر و پیاوی سیاسیی کوردە. ساڵی ١٩١٢ لەکاتی جەنگی بالقان لایەنگیری تورکەکان بوو. یەکێك لە دامەزرێنەرانی جەمعیەتی تەعالی و تەرەقی کورد و لە گۆواری ژین گەلێك وتاری لەسەر پرسی کورد بڵاوکردۆتەوە. دوای تەواوکردنی خوێندن لە لایپزیك لە ئەڵمانیا دەگەڕێتەوە بەیروت و مەکتەبی موحامات دەکاتەوە. ساڵانی ١٩٣٠-١٩٤٠ کۆمەڵێك وتار و کتێب بڵاودەکاتەوە و ساڵی ١٩٤٧ دەچێتە پاریس و لە قوتابخانەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان وانەی زمانی کوردی دەڵێتەوە و ناوەندی لێکۆڵینەوەی کوردی دەکاتەوە. ساڵی ١٩٧٠ بوو بە زمانحاڵی بارزانی ئەورووپا.

***

●محەمەد ئەمین زەکی (سلێمانی ١٨٨٠-سلێمانی ١٠ ی تەممووزی ١٩٤٨). لە قوتابخانەی ئەعدادییەی عەسکەری لە بەغدا ساڵی ١٨٩٦ خوێندویەتی و دواتر چۆتە ئەستەموولّ و قوتابخانەی عەسکەری ساڵی ١٨٩٩ لە ئەستەموولّ تەواو دەکات و کانوونی دووەمی ١٩٠٢ دەبێتە مولازمی یەکەم. لە بەغدا، ئەدرنە، ئەستەموولّ و چەندین شوێنی دیکە پلە و پایەی عەسکەری بینیووە و خزمەتێکی زۆری سوپای عوسمانی کردووە، دوای ئاگر بەس گەڕاوەتەوە بەغدا و ماوەیەکی زۆر وەزیر و ئەندامی پەرلەمان بووە و یەکێك بووە لە مێژوونووسە گەورەکانی کورد و خاوەنی کۆمەڵێك کتێبی عەسکەری و مێژووییە لەبارەی شەڕەکانی عوسمانی و مێژووی کورد.

***

● مەمدوح سەلیم (وان ١٨٩٧-شام ١٩٧٦). مامۆستا و پیاوی سیاسیی کوردە، ئەندامی جەمعیەتی تەعالیی کوردستان و سەرنووسیاری گۆڤای ژین بوو. سەرەتای دامەزراندنی کۆماری تورکیا وەك زۆربەی ڕوناکبیرانی کورد پەڕیوەی شام بوو و پاشان بوو بە مامۆستا لە ئامادەیی ئەنتیۆش تاوەکو ساڵی ١٩٣٨.

***

● موسا عەنتەر (ماردین ١٩٢٠-ئامەد ١٩٩٢/٩/٢٠). ڕۆماننووس و نووسەر و ڕۆژنامەوان و سیاسیی کوردە. دەرچووی کۆلیژی قانوونی زانکۆی ئەستەمووڵە. کاری ڕۆژنامەنووسی کردووە و ماوەیەك لە زیندان بووە و نووسەری چەندین کتێبە لەوانە: برینی ڕەش (١٩٥٩)، فەرهەنگی کوردی (١٩٦٧)، بیرەوەرییەکانم (دوو بەش). لە ٢٠ ی ئەیلوولی ١٩٩٢ لە لایەن پیاوە نهێنییەکانی دەوڵەتی تورکیا لە گەڕەکێکی ئامەد تیرۆر کرا.

# ئیندێکسی
# ناوی کەس و شوێن

## ناوی کەس

### ئا


ئاگۆپ سیمۆن:٧٨

ئا، بریاند:٥٦

ئەسیری: (٥٧پ)

ئانوو-بانیی (پاتشای گۆتییەکان):٤٢

ئەدمۆندز (مێجەر س.ژ):٤٢

ئیسماعیل ئەفەندی ڕەواندوزی: ٢٦، ٧٦

ئیسماعیل گوێڵداش: (٢٤پ)، ٣٦

ئیتیحاد و تەرەقی:٣١

ئیدریسی بتلیسی:٤٧

ئیمپراتۆریای هابسبۆرگ:٥٦

ئیمپراتۆریای عوسمانی: ، (پ)، ٧، ٤٨، ٦٦، ٨٧

ئەلیاس سامی ئیف، ئەندام پەرلەمانی مووش:٥٧

ئەکرەم جەمیل بەگ:٧٩

ئەکرەم جەمیل پاشا: ٧٤، ٨٣

ئەمین عالی بەگ:٧٤-٧٥، ٨٨

ئیبراهیم شەمدین:٧٨

ئەلیاس ئەفەندی دێریکاوی:٧٨

ئۆنگۆر: (٢١پ)

ئەیووب مللی زادە:٧٩

ئەحمەد بەگی جەمیل پاشا:

ئیبراهیم بەگ:٧٩

ئیسماعیل بەگ:٧٨

ئیتحاد و تەرەققی (کۆمیتەی): ١٠، ٢٠-٢١، ٥١

ئەحمەد ڕامز: (٥٢ پ)

**ب**

بابان زادە حوسێن شوکری:٧٥

بیلال شمشیر: ١٦

بالقان (جەنگی):٥٢، ٨٣، ٩٠

بۆزان بەگ شاهین:٧٨

برنجی زادە صدقی بەگ:٧٩

باقیێ تۆژۆ: (٢٤پ)

## ث

پارتی دیموکراتی کورد (١٩١٩): (٥٧پ)

پارتی کرێکارانی کوردستان: ١٥

## ت

تارلەبە بەگ:٧٧

تۆفیق وەهبی بەگ:٨١، ٨٣-٨٤

پیرنجی زادە عارف: ٢١

## ج

جڤاتا هێڤی قوتابیانی کوردان :

جەمعیەتی تەعالیی کورستان: ١٠، ٢٣، ٥٧، ٨٣، ٨٨، ٩١

جەمعیەتی ئیجتیماعیی کورد:١٠، ٢٣، ٧٣، ٧٥

جەمعیەتی کورد تەعاون و تەرەققیی:٢٠، ٥١

جەڕاحزادە زەکی دیاربەکرلی:٢٢

جەلادەت بەدرخان: ٢٩-٣٠، ٧٤، ٧٨، ٨٤

جەلال بەگ مللی زادە:٧٩

جەمال بەگ:٨١

## ح

حاجۆ ئاغا: ٧٨، ٨٤

حازم بەگ نایبی زاخۆ:٨١

حیزبی کرێکاران و جوتیارانی تورکیا: ٣٣

حەمید بۆزئەرسلان (پرۆفیسۆر):( ١٩پ)

حوسێن حامی بەگ:٧٤

حەمدی بەگ، هۆزی خەشنیێ:٧٩

حورپیەت و عەدالەت: (٥٢پ)

## خ

خالید بەگ:٧٧

خۆیبوون:١٠، ٢٥، ٢٦، ٣٦، ٧٦، ٧٧، ٨٣، ٨٤

خەلیل بەدرخان:١٥

خەتیب بەگی صفیالدین پاشا:٧٩

خورشید ڕەشید وانلی:٨٠

خەلیل خەیالی: ١٥

## د

داماد زوکفل پاشا: (٥١پ)

## ڕ

ڕەفیق حیلمی:٢٨، ٣٨
ڕۆهلات ئالاکۆم: ٢٢، ٣٦
ڕۆژی کورد: (٥٧پ)
ڕەسووڵ ئاغا:٧٨
ڕەشید بەگ:٨٠
ڕەئووف بەگ:٨٠، ٨٢

## ز

زەحیا بەگ (د):٧٩
زیا بەگی جەمیل پاشا: ٧٩
زیا گۆك ئالپ: (٢٤پ)

## ژ

ژین:( ٥٧پ)،
ژۆردی تەژیل: ٢٢

## س

سمکۆی شکاك:١١، ٨٥

سورەیا بەگ بەدرخان (د):٨١

سپایسەر (پرۆفیسۆر):٤١

سەرگۆن: ٤٢

سوڵتان سەلیم (یاوز):٤٨

سەیید عەبدولقادر شەمزینانی:٢٣، ٨٥

سێلتەکان: (٥٩پ)

سەعدۆ ئاغا غەسۆ (سەرۆکهۆزی "مەشکینا":٧٩

سەیید محەمەد:٨٠

سەعید پاشا:٨١

سەیید حوسێن حوزنی موکریانی:

سەلاحەددینی ئەیبوبی: ٨٦

سولێمان نەزیفی: (٦٢پ)

## ش

شوکری محەمەد سەگبان (د): ٣ -٥، ١٠-١٧، ١٩-٢٠، ٢٢، ٢٣، ٢٥، ٢٦، ٢٧-٣٢

شێخ مەحموودی حەفید: ١١، ٨٥، ٨٩

شەریف پاشای خەندان:١٢، ٢٨، ٨١-٨٨

شەمسەددین، ئەندام پەرلەمانی ئەرتەغۆل:٥٧

شوکری بەگی بەبە:٧٤

شەوقی ئەفەندی:٢٦، ٧٦، ٧٩

شێخ فەتحوڵڵا، سەرۆکهۆزی مالمیێ:٨٠

شێخ فکری:٧٩

شێخ جەلال:٨٠

شێخ فەوزی، سەرۆکهۆزی سیلوان:٧٩

شێخ نەسرەت ئەفەندی:٨٠

شێخ موحیەددین زوکریت:٨٠

شێخ ئازارت، سەرۆکهۆزی بۆتکی:٨٠

شێخ ئەحمەد، ئامۆزای شێخ سەعید:٨٠

شێخ سەعیدی پیران:٨٨

## ع

عەبدوللا ئۆجالان: ١٥-١٦

عومەر جەمیل پاشا:٢٢

عەبدوڵڵا زەنگەنە:٣٦

عەبدوڵڵا جەودەت (د): ٢٣، ٧٤، ٨٩

عومەر ئاغا شەمسەددین:٧٨

عوسمان عرووسی:٧٨

عەلی ئاغا، سەرۆکهۆزی سلیوان:٧٩

عەبدولکەریم بەگ (کەریم مەحموود ڕۆستەمی ناسراو بە کەریم شالوومە):٨٠

عەبدوڵڵا بەگ، ئامۆزای سەیید تەها:٨١

عەدنان بەگ:٨٢

عیسمەت ئین: (٢٤پ)

عەبدولڕەحمان بەدرخان: (٥٢پ)

**ف**

فانی زادە عەلی عیلمی: ١٥

فوئاد تورگوت (پارێزەر): ١٦

فوئاد تەمۆ: ، ٢٢

فەیزی پیرنجچی بەگ:٢٤

فکری بەگی جەمیل پاشا زادە:٧٩

فرانسوا تۆرو دەنگین: (٤٢پ)

**ق**

قەدری جەمیل پاشا (زنارسلۆپی):٢٢

**ك**

کادوور بەگ:٧٨

کارداکا :٤٢

کامیران بەدرخان: ٨

کوردەکان چیان لە تورکەکان دەوێ؟ (نامیلکە): ٢٤

کورد مسئلەسی صفحاتن (نامیلکە):٢٨

کونێ ڕەش:( پ)٢٥، ٣٨

کۆمەلەی گەلان:٢٧

کەریم خانی زەند:٥٠

کریکۆر ئەفەندی:٨٠

کامەران عالی بەدرخان:٧٧، ٩٠

کۆمەڵەی کورد و کوردستان:٢٣


## ل


لیڤۆن پاشا:٨١

لوتفی فیکری: (٥٤پ)


## م


مارتین شترۆمییێر: ١١، ٢٨

ماکس هێلدەبێرت بۆیم:١٢، ٥٩

مالمیسانژ (پ):

مستەفا کەمال: ٩، ١٤، ١٥، ٣١-٣٤، ٦٧

مەسعوود فانی (د): ١٥

مەولانا ڕەفعەت زادە:١٥

مستەفا شەوقی ئەفەندی: ٢٦، ٧٦

مودرۆس (ئاگربەس): ٢٣

مەمدوح سەلیم:٢٣، ٢٩، ٧٤، ٧٨، ٩١

مووسا عەنتەر:٣١-٣٢، ٩١

میدییەکان:١٣، ١٤، ٤٣، ٤٤، ٤٦

مستەفا بەگ شاهین:٧٨

محەمەد بەگی جەمیل پاشا:٧٨

مەحموود کارۆ، سەرۆکی هۆزی "خورس":٧٩

مەمدووح بەگی جەمیل پاشا زادە:٧٩

مەمدوڵلا بەگ، هۆزی خەشنێ:٧٩

محەمەد بەگ، هۆزی خەشنێ:٧٩

مەحموود جەودەت:٨٠

موراد خان، سەرۆکهۆزی گۆیان:٨١

محەمەد حەسەن:٨١

میبران خانوم:٨٢

محەمەد ئەمین زەکی بەگ:٩٠

موفتی سوبحی: ٢٠

میر کاتب زادە ئەحمەد جەمیلك: ٢١

محەمەد تاهیر: ٢١

## ن

نادر ئینتیسار: ١٥

ناجی بەگ:٨١

نەجمەددین حوسێن:٢٣، ٥٧، ٧٤

نەجاتی عەبدوڵڵا (د) ٣٧

نەعیم بەگی بابان: ٢٠، ٥١

نوری سەعید: ٣٢

نەرامسین (پاشای ئەکەدییەکان):٤٢

نەجمەددینی دروێش کبار :٧٧

نەجمەددین بەگ:٧٩

## ه

هەتاوی کورد: (٥٧پ)

هەمزە ئەفەندی :٧٨

هیرات پاپازیان:78

هەمزەی کوڕی بەکر کوردی:٧٨

## و

واهان پاپازیان:٧٧

# ناوی شوێن

## ئا

ئەنادۆل: ٩، ١٣، ٤٦

ئەلعەزیز:٨٩

ئەرغەنی:١٩

ئەستەمووڵ: ٨-٩، ٢٠-٢١، ٢٣-٢٤، ٣٣، ٧٣، ٨٣-٨٥، ٨٧-٩١

ئێران:١١، ١٥، ٤٤، ٤٥، ٥٠، ٨٦، ٨٨-٨٩

ئەزمیر: (٤٥پ)

ئەتلەتنتیك:٤٨

ئەدریاتیك:٤٨

ئەفریقای باکوور:٤٨

ئاسیا:٤٤-٤٥

ئورفە: (٤٧پ)

## ب

بەندەر عەباس:٤٤

بەغدا:٨، ١٠، ٢٣، ٢٥، ٢٦، ٣٣-٣٤، ٨٠، ٨٣، ٨٤، ٨٩-٩٠

بەرلین: ٢٠، ٢٥

بەیرووت:٢٤

بولگاریا: (٥٧پ)

## پ

پاریس : ١٢-١٣، ٢٠، ٢٥، ٢٧، ٨١، ٨٨

پاقرمادەن:١٩

پالۆ:٨٨

پیرەمەگرون:

## ت

**تورکیا:٩، ١١، ١٤، ١٥، ٢٣، ٢٨، ٣١، ٣٣، ٣٧، ٤٩، ٥٣-٥٤، ٥٩، ٦٣، ٦٥، ٦٧، ٦٨-٦٩، ٧٥، ٧٨، ٨٢، ٨٦، ٨٨، ٩١**

## ج

جەزایر:٤٨

## ح

حەلەب:٧٨، ٨٨

حەسەکە:٧٨

## خ

خەزەر (زەریا):١٣، ٤٣، ٤٥، ٤٨

## د

دەربەندی گاور:٤٢

دیاربەکر: ١٩-٢٤، ٧٤ن ٧٩، ٨٥، ٨٨-٨٩

دیمەشق:٧٦، ٨٦

دێترویت مەشینگان:٨١

دێرزوور:٨٤

## ر

ڕێن :٥٨

ڕەواندوز:٨١

## ز

زەهاو:٤١

زەریای هیندی:٤٨

زەریای ڕەش:٤٨

زاخۆ:٨١

## ژ

ژنێف:٩٠

## س

سلێمانی: ١٧، ٣٦، ٤١، ٤٢، ٦٠، ٧٨، ٨١، ٨٣-٨٤، ٨٨، ٨٩
سلیوان:٧٩، ٩٩
سەحوور:٧٩
سێرت:٨٠
سیرکەچیی: (١١پ)
ستۆکهۆلم:٨٨

## ش

شام:٣٠، ٨٣-٨٣، ٨٦، ٩١

## ع

عێراق: ١١، ٢٦، ٢٧، ٢٨، ٣٣، ٣٦، ٤١، ٦٠، ٧٦، ٨٣، ٨٤، ٨٥، ٨٦، ٨٩
عەبدولڕەحمان پاشا (پرد): ٨٨
عەرەبگیر:٨٩

## ڤ

ڤیەننا:٢٠، ٤٨

## ق

قەوقاز: ٤٥

قاهیرە:٨، ٢٤، ٣٣، ٥٦

قزل کلیسە:١٩

قەرەداغ: ٤٢

## ك

کەرکووك:٧٤، ٨٠، ٨٤

## گ

گوڵخانە (ئەکادیمیای پزیشکەوانیی سەربازیی): ٢٠

## ل

لەندەن: ٢٥، ٨٢-٨٤

لیدیا:٤٥

لوبنان: ٢٥، ٨٧

لیبیا :٩٠

م

ماردین: ٧٨، ٧٩، ٩١

مەشهەد:٤٤

مانیا (پ):

میدیەت: ٨٤

مۆناکۆ:٨٨

مووسڵ: (٤٧پ)

مەککە:٨٥، ٨٧

ن

ناپۆلی: ٨٧

نیمچە دوورگەی عەرەبی:٤٨

ه

هۆزات:١٩

هیرات:٤٤

# ناوەڕۆك


لە برێتی پێشەکی ............................................................................................................ ٧

پۆرترێتێکی شکاو: سەرچلێك لەبارەی ژیان و بەرهەمەکانی دکتۆر محەمەد شوکری سەگبان ......١٩

کێشەگەلی کەمینەنەتەوەکان ........................................................................................ ٤١

پاشبەند ............................................................................................................... ٧١

بیۆگرافیا ............................................................................................................... ٨٣

ئیندێکسی ناو و شوێن............................................................................................... ٩٣